گوڵبژێرێک لە هەڵسەنگاندنەکانی

**عەبدوڵڵا ئۆجالان**

# ئیسلام
# و
# نیشتمانپەروەری



# ناوەڕۆک

## پێشەکی

ئایین راستینەیەکە لەگەڵ بە جڤات (کۆمەڵگا)بوونی مرۆڤەوە، واتە لەگەڵ بە مرۆڤبوونی جۆری مرۆڤەوە سەری هەڵداوەو تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. لەهەر سەردەمێکی ژیانی جڤات و کۆمەڵگای مرۆڤایەتی شێوەو فۆڕمی تایبەت بەخۆی وەرگرتووە؛ بەڵام لە لایەنی شێوەو رووخسار زیاتر ئایین راستینەیەکە راستەوخۆ پەیوەندی بە دۆخی زیهنی، یادگاو هزری مرۆڤ و کۆمەڵگاکەیەوە هەیە، راستەوخۆ بەشێکی گرنگی کولتووری کۆمەڵگاکەمان (مرۆڤایەتی) پێک دێنێت، بە تایبەتیش لایەنی رۆحی و ئەخلاقی - ویژدانی مرۆڤ پەیوەندیدار دەکات. بەڵێ ئایین هێزێکی هزرییە، ئەم هێزە هزرییەش یەکەمین رێساو بەهایە کە بە شێوەی دابونەریت یاخود راوەستەی ئەخلاقی لە یادەوەری کۆمەڵگا وەک دەزگایەکی سەرەکی و یەکەمین هەبوونی هاتۆتە ئاراوە، بەسیفەتی خەیاڵ و یۆتۆپیای سەبارەت بە داهاتوو دەبێتە بەهایەکی هێزی ژیان. لەبەر ئەوەی ئایینی کۆمەڵگا وەک دابونەریت و ئەخلاق هەم یادەوەری رابردوو هەم خەیاڵ و ئومێدی داهاتوو لەخۆوە دەگرێت و بەیەکەوە نوێنەرایەتی یۆتۆپیای سەرەکی دەکات؛ هەر لە سەرەتاوە وەکو دەزگایەکی سەرەکی کۆمەڵگا جێگایەکی گرنگ و پڕ بایەخی گرتووە. پەیوەندییەکی دیالیکتیکی و ژیانی لەنێوان ئایین و کۆمەڵگادا جێگای باسە.

زاراوە ئایینیەکانیش هێزی دەرکپێکردنی کۆمەڵگان لە قۆناخەکانی خۆیاندا. بۆیە هەرگیز نابێت لەمیانی چەمکێکی قەبای ماتریالیستیانە بابەتەکە تاوتوێ بکرێت، چونکە ئەم جۆرە هەڵوێستانە مەترسیدارن، بەرەو چەنەبازیەکی بێواتای دوور لە زانستیبوون دەچێت. هەڵوێستی راست ئەوەیە پێگەو رۆڵی ئایین لەناو راستینەی کۆمەڵگا تاوتوێ بکات، چییەتی هێزەکەی و کاریگەریەکەی بگرێتە دەست.

پاشڤەڕۆیی و محافەزەکاری ئەوەیە کە ئاستی ماناو تێگەیشتنی قۆناخێک وەک راستینەیەکی رەها پەسەند بکرێ، بە بێ خوێندنەوەو رەچاوکردنی هەڵومەرج و رۆحیەتی کۆمەڵگای سەردەمی نوێ وەک خۆی بە سەر هەرکەس، گەل و کۆمەڵگایەکدا بسەپێنرێت. کاتێک دۆگماتیزمی ئایینی، شرۆڤەی جیاواز و

چەواشەکاریەکانیش یەک دەگرن، ئەوا بەڵاو کارەساتی گەورە روو دەدات و لەژێر نـاوی ئاییـنـەوە مرۆڤایـەتی دووچـاری درندانـەترین پـەلامارەکانی کۆمـەڵکوژی دەبێتەوە.

لەبەر ئەوەی مرۆڤ بۆخۆی گەردوونێکی بچووکە، پێکهاتەیەکی سەمەرەو سەرسوورهێنەری هەیە، جیاواز لە بوونەوەرەکانی دیکە تەنیا بە سێ پێویستیە سەرەکیەکە (خۆراک، ئاسایش، زۆربوون) سنووردار نییە، بەڵکو بەهۆی پێکهاتە تایبەتەکەی لایەنی رۆحی - مۆراڵ و ویژدان - ئەخلاقی هەیە. هەر لە سەرەتای بە مرۆڤبوونیەوە لە رێگای ئایینەوە هەوڵیداوە ئەو پێداویستیە بنەڕەتیانەی دابین بکات و لە رێگایەوە هێز بەدەست بێنێت، خۆشی بە کەناری ئارامی بگەیەنێت.

خۆرهەڵاتی ناوین بە گشتی هیلالی زێرین و میزۆپۆتامیا بە تایبەتی شوێنگەی دەرکەوتنی زۆربەی ئایینەکانن؛ بە تایبەتی ئەو ئایینانەی بە شێوەیەکی بەرفراوان بڵاو بوونەتەوە و تا رۆژی ئەمڕۆمان کاریگەریەکی بەهێزیان لەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەیە. بە تایبەتیش هەر سێ ئایینی ئیبراهیمی کە "ئاسمانین" و بۆ هەر سێ پێغەمبەرەکە هاتوونەتە خوارەوە. لە کاتێکدا ئەم ئایینانە هەر یەکەیان لە قۆناخی خۆی وەک شۆڕشی کۆمەڵایەتی و ریفۆرم هاتنە ئاراوە، سەرەتا وەک ئایینی کۆمەڵگا رۆڵی ئەرێنی و بونیادنەرانەیان بینی، دژی کۆنەپەرستی و ستەم و کۆیلایەتی بوون، بەڵام دواتر کە بوون بە ئایینی فەرمی، واتە کە بوون بە ئایینی سوڵتەو دەسەڵاتگەرێتی؛ چەواشەکران، لە گەوهەری راستەقینەی خۆیان دوور خرانەوەو تەنیا وەک ئامرازێک لەلایەن دەسەڵاتداران و ستەمکاران بەکارهێنران، لەجیاتی ئازادی کۆیلایەتی، لەجیاتی عەدالەت بێ عەدالەتی و لەجیاتی برایەتی چەوسانەوە و کۆمەڵکوژیان بەناوی ئایینەوە ئەنجام داوە.

بەڵێ لەژێر ناوی ئایین و مەزهەبگەراییەوە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی چەندین شەڕ، کارەسات و کۆمەڵکوژی زۆر درندانەی بەخۆوە بینیوە؛ ئەم دۆخە تا رۆژی ئەمڕۆشمان لە ناوچە جیاوازەکان بەردەوامە، بە تایبەتیش لە شوێنی سەرهەڵدانی ئایینەکان، واتە لە خۆرهەڵاتی ناوین بەردەوامە.

وڵات و دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانی سەرکوردستان ساڵانێکی درێژە ئایین وەک ئامرازێک بەکار دێنن، لە رێگایەوە دەسەڵات، پاوانکاری و بەرژەوەندیەکانی خۆیان مسۆگەر کردووە. لە لایەکی دیکەشەوە لەمیانی بەکارهێنانی هەمان ئامرازەوە

گـەلی کوردسـتان بـە گشـتی، گـەلی کـورد بـە تایبـەتی دووچـاری خەڵەتانـدن، چەواشەکاری و کارەسات هاتووە.

لە ساڵانی نەوەدەکان لە سەردەمی بەرفراوانبوونی رێکخستنی جەماوەری و بەرزبوونەوەی ئاستی سەرهەڵدانی گەلی کورد لە باکووری کوردستان، دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانی سەر کوردستان بە تایبەتیش ئێران و تورکیا رێکخستنێکی کۆنترگەریلاییان بە ناوی "حزبوڵا" لە باکووری کوردستان ئاوا کرد، لە رێگایەوە هەوڵیاندا پەرەسەندنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردستان بەربەست بکەن، بۆیە ئەو رێکخراوە کۆنتراییە لەژێر ناوی ئایین و ئیسلامیەتەوە بەکارهێنرا، هاوشانی خەڵەتانـدنی کەسـانێکی زۆر لـە کـوردە باوەڕمەنـدەکان و بـەکارهێنانیان وەک ماشایەک، بەدەستی چەپەڵیان بە هەزاران کورد و کوردستانی نیشتیمانپەروەریان کوشت و گوللەبارانیان کردن، نزیکەی بیست هەزار وڵاتپارێز بوونە قوربانی تاوانەکانی "بکوژی نادیار" کە بە دەستی ئەو تاخمە نۆکەر و بەکرێگیراوە ئەنجام دران. بـەڵام کاتێـک دەوڵـەتی تـورک کـاری بـەو گرووپـە نـەما لـە سـاڵی ٢٠٠٠ ئۆپەراسیۆنێکی بەرفراوانی لە بەرامبەر ئەنجام دان، چەندین سەرکردەیان کوژران و چەندینی دیکەش خرانە زیندانەکانەوە.

لە ساڵی ٢٠١١ لەگەڵ دژواربوونی ئاستی تێکۆشان لە باکووری کوردستان حکومـەتی ئاکەپـەی بـەناو ئیسـلامی لێبـوردنێکی تایبـەتی بـۆ ئەنـدامانی گرووپـی کۆنترایی بە ناو "حزبوڵا" دەرخست، بە یارمەتی هەر دوو دەوڵەتی تورکیا ـ ئێران بە ناوی هوداپار خۆیان وەک پارتێکی فەرمی رێکخستووە. لە ساڵی ٢٠١٢ بە دواوە لەگەڵ داعش بە یەکەوە دژ بە گەلی کوردستان بەکاردەهێنرێن. داعش لە خۆرئاوا و باشووری کوردستان، هوداپار یش لە باکووری کوردستان لەلایەن دەوڵەت و حکومەتی تورکیاوە دژ بە کوردان بەکار دەهێنرێن.

چەند ساڵێکە لە باکوور و خۆرئاوای کوردستان گرووپە بەناو ئیسلامگەرا رادیکالەکان دژ بە گەلی کورد و بزووتنەوە ئازادیخوازەکەی بەکاردەهێنرێن. بە تایبـەتیش نزیکـەی سـاڵێکە ئـەو گرووپـە چەتەگەریانـە لـەمیانی یـەکانگیرکردنی میللیگـەرایی ـ شـوڤێنیزمی بەعسـی عـەرەبی لەگـەڵ فاشـیزمی ئیسـلامگەرایی دەسەڵاتگەرا، هێرشێکی بەرفراوانیان بۆ سەر تەواوی گەلی کوردستان دەست پێکردووە بە تایبەتیش لە خۆرئاواو باشووری کوردستان.

بێگومـان ئـەو گرووپـە چەتەگەریـە هـیچ پەیوەندیـەکی بـە راسـتینەو گەوهـەری ئیسلامەوە نییە، بەڵکو لای هەرکەسێک ئاشکرا بووە کە ئامرازێکن بە دەست هێزە جیهــانی و هەرێمیــەکان، ســەرمایەداری جیهــانگیری بــە ئامــانجی بــەدیهێنانی بەرژەوەندییە هەمەلایەنەکانی خۆی بەکاریان دێنێ.

وەک لە تاوانە گەورەکانی ئەو گرووپە دروستکراو و ئاراستەکراوانە بینیمـان، ئەمانــە دژ بــە فرەرەنگــی و جیاوازیــەکانن و خوازیــارن لــۆژیکی رەش و ســپی بسەپێنن. لەو سۆنگەوە؛ ئامێرێکی قڕکردن و لەناوبردنی گرووپە ئەتنیکی، ئایینی و مەزهەبیەکانن. ئەمەش بە شێوەیەکی بەرجەستەتر لە هێرشەکانیان بۆ سەر کوردە موسڵمانەکان، ئێزدیەکان، شەبەک و کاکەییەکان و هـەروەها لـە پـەلامارەکانیان بـۆ سەر کرستیان و ئاشووری ـ سریانیەکاندا دەبینرێت.

ئەو جۆرە گرووپانە لە هەر قۆناخێک و لـە هـەر شـوێنێک لـەژێر نـاوی جیاواز دەردەکەون، بەڵام زهنیەت، لۆژیک، چـەمک و خەسڵەکەتانیان هـەمان شـتە؛ لـەژێر نـاوی ئـایین، بـە تایبـەتیش لـەژێر نـاوی ئـایینی ئیسـلام، ئـایینی ئیسـلام چەواشـە دەکـەن، گـەورەترین دوژمنایـەتی بەرامبـەر خـودی ئـایینیش دەکـەن. ئـەم جـۆرە رەوتانە بە هەموو شێوەکانیانەوە نوێنەرایەتی ئیسلامیەتی دەسەڵاتگەرا و دەوڵەتی دەکەن، نوێنەری شۆڕشی چەواشەی ئیسـلامن. لەمیانی ئـەو رێبازەیانـەوە شـەڕی ئــایینی و مەزهــەبی بەســەر گەلانــدا دەســەپێنن و خوازیــارن باخــە کولتوورییــە رەنگاورەنگەکەی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین کۆتایی پێ بێنن و بۆ بیابانێکی وشـک و چۆلەوانی بگۆڕن.

هـەرچی ئیسـلامی دیموکراتیک یـاخود ئیسـلامی کولتوورییـە دژەژەهـری ئـەو ئیسلامە ساختە و دەسەڵاتگەرایەیە. ئیسلامی راستەقینە و گەوهەرەکـەی بـە بنـەما دەگرێــت نــەک شــێوەو رووخســار. لــەجیاتی نکـوڵیکردن لــە ئــایین و مەزهەبـە جیاوازەکان، بە رۆحی برایەتی و لێبووردنـەوە گشـتیان پەسـەند دەکات و رێزیـان لـێ دەگرێت، بـەم جۆرەش لۆژیکی رەش و سـپی تێپـەڕ دەکـات و برایـەتی نێـوان ئـایین، مەزهـەب، ئـەتنیک و گـەلان بـە بنـەما وەردەگرێت. ئیسلامی راسـتەقینە ئـەو ئیســلامەیە کــە دوور لــە دۆگمــاتیزم و محافەزەکارییــە، لــەجیاتی چەقبەســتن نوژەنبوونـەوە بـە بنـەما وەردەگرێـت؛ بـەها ئەخلاقییـە جوانـەکانی ئیسـلام لەگـەڵ پێوانە بەرز و شکۆدارەکانی مرۆڤایەتی ئەمڕۆمان ئاوێزان دەکات، لـەم سـۆنگەوە؛

ڕێنسانسی خۆرهەڵاتی ناوین دەکاتە ئامانجی خۆی، لە ڕێگای ئەم ڕێنسانسەوە دەشێ نەتەوەو ئیسلامی دیموکراتیک ببن بە ڕاستینەیەکی ژیانی و بەرجەستە.

بە ئامانجی خزمەتکردن بەو ڕاستینەیە بە پێویستمان زانی کە ئەم شیکردنەوانەی ڕێبەری گەلی کورد ڕێبەر ئاپۆ بۆ سەر زاراوەی کرمانجی خوارووو (سۆرانی) وەرگێڕین و پێشکەش بە خوێنەرانی بکەین. لەو بڕوایەداین کە بۆشاییەک پڕ دەکاتەوەو بۆ تەواوی گەلی کوردستان بە تایبەتیش بۆ باوەڕمەند و ئیسلام دۆستان سوودبەخش دەبێت.

چواری نیسانی ٢٠١٥

ئەکادیمیای زانستە کۆمەڵایەتیەکانی عەبدوڵڵا ئۆجالان

# بۆ کۆنگرەی ئیسلامی دیموکراتیکی کوردستان

خوشک و برایانی باوەڕمەند!

لە کاتێکدا لە ناوەندە سەرەکیەکانی ئیسلام پەرتەوازەبوونێکی لەرادەبەدەر، خیانەت و یاخیبوونێکی مەزن لە ئارادان، وێڕای دەرککردنم بەو نیگەرانیانەی گوایە دەشێ ڕێگا لە پێش تێگەیشتنێکی هەڵە و ناتەواو بکاتەوە، بەڵام بە ئامانجی بەربەستکردنی هەڵەی مەزن و ڕێکردنەوە لەپێش ڕاستیەکانی ناواخن و ناوەڕۆکەکەی، بە بێ هیچ دوودڵیەکەوە دەستەواژەکانی "کوردستان" و "دیموکراتیک"م بەکار هێنا؛ بەتایبەتیش لە کاتێکدا لەمیانی ڕوانگەی دەوڵەتگەرایی هەر دوو ناوەندی گرنگ و مەزنی ئیسلام، واتە ڕەوتەکانی شیعەگەری ـ ئێران و ڕەوتەکانی دەسەڵاتگەرێتی سەلەفی ـ عەرەبی کە لە ڕۆژی ئەمڕۆشمان خۆیان دەسەپێنن و ڕێگایان لە پێش داڕووخان و وێرانکاریەکی مەزن کردۆتەوە: ئەوا بەرزکردنەوەی ئاڵای تێکۆشان لەمیانی دەستەواژەکانی جوگرافیا، گەل و دیموکراسی بە پێویستیەکی وەفاداری و پابەندبوون بە ڕاستیەکانی ناواخنی ئایینی ئیسلام دەبینم. بەرامبەر ئەو دوو ناوەندە دەسەڵاتگەرێتی ـ دەوڵەتگەرێتییە، گەڕان بەدوای وەڵامێکی ئیسلامیانە و دۆزینەوەی گوزارشتە سیاسی و ئەخلاقیەکەی هەڵمەتی دیموکراتیانەی قەڵەمبازی دژبەر و گەیاندنی بە ئاستی ئیرادەبوون، سەرەکیترین ئەرکی کۆنگرە هێژاکەتانە و لەو چوارچێوەیەدا سڵاو و ڕێزی خۆمم پێشکەشتان دەکەم.

هەر دوو ڕەوتی سەرەکی ناوەندگەرا، دەسەڵاتگەرا و دەوڵەتگەراش لە چوارچێوەی هەڵکشانی سەرمایەداری ـ ئیمپریالیستی گەشەیان کردووە و لە هەرەسهێنانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی جەمسەری سەڵتەنەتی دەسەڵاتدارێتی ئەو قۆناخە بەکار هێنراون. بەتایبەتیش لەلایەن ئیمپڕاتۆریەتی ئینگلتەراوە بەکار هێنراون کە وەک هێزە نوێیەکەی هەژمونگەرایی جیهان لە هەڵکشاندایە. تا ئێستاش بەردەوام بەکار دەهێنرێت.

هەر دوو ناوەندیش تا دوایی میکرۆبی میللیگەراییان لە دژی ناوەڕۆکی ئیسلام بەکار هێناوە. لە سەرهەڵدان و دامەزراندنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆیان هەرگیز لە داسەپاندنێکی ستەمکارانەی رژێمی سیستەمی دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوەگەرایی سیستەمی سەرمایەداری بەسەر گەلانی خۆیان دوودڵییان نەکردووە. کەچی لە راستیدا چەمکی ئومەتی ئیسلامی لە رووی ناوەڕۆکەوە لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە ناکۆکە و هەرگیز کۆک نابێت.

هەڵبەتە ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز لەپێناو پارچەکردنی ئومەتی ئیسلام، بە شێوەیەکی زۆر وریا و بە بەرنامە دەوڵەت ـ نەتەوە و ئایدیۆلۆژیا سەرەکیەکەی واتە میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی) لە دڵ، مێشک و خەیاڵدانیدا جێگیر کردووە. مێژووی ئەو دوو سەدەیەی دوایی گەلان و جوگرافیای ئیسلام بە جۆرێک لە جۆرەکان بەو دەستدرێژیەی سەر مێشک و خەیاڵدانیان دەرباز بووە.

خوشک و برایانی باوەڕمەند!

لە راستیدا بە ناوی سەرجەم ئایینەکان ئیسلام نوێنەرایەتی دواترین گەردونیبوون دەکات. ئیسلام هەم ئایینییە هەم فەلسەفی، لەو سۆنگەوە؛ گەردوونیبوونێکی زانستییە. هەمان ئەو ئایین و فەلسەفەی زۆر گرنگی پێ دەدەم، واتە ئەو ئیسلامەی لام گرنگە و بایەخدارە لە هەمان کاتدا لە رووی دەستەواژەی "پاژە"وە راستیەک هەیە کە گوزارشت دەکرێت و لە بواری کرداری و ژیانیشدا بەرجەستە و جێبەجێ دەکات. لە کاتێکدا لایەنی گەردوونی بە سیفەتی "یەکێتی و تاقانەیی ئەڵڵا" بە شێوەیەکی بەهێز گوزارە لەخۆی دەکات و بە کولیاتێکی شکۆدار دەگات، بە هەمان گرنگیەوە راوەستە سەبارەت بە "پاژە" نەکراوە کە لەسەر ئەو راستیە ئاوا کراوە، چەندین شرۆڤە و کرداری ناتەواو، چەوت و شەڕانگێزانەی لەبارەوە پێشخراوە و پەیڕەو کراوە. یەکێک لە سەرەکیترین ئەرکەکانمان: بە هەمان بەرپرسیارێتی و لێهاتووییەوە ئەو هەموو تاکەکەسانە (ناس) تاوتوێ بکەین کە هێندەی (ناس) مرۆڤەکانی ئەڵلای بێزەمان و بێمەکان زۆرن، لەو چوارچێوەیەشدا مافەکانیان بەدەست بهێنرێت یاخود پێشکەش بکرێت. ئەگەر بە گوزارشتێکی زانستیانە بیڵێین پێویستە بە شێوەیەکی ئازاد و عادیلانە پرەنسیپە گشتیەکان سەرکەوتووانە جێبەجێ و بەرجەستە بکرێت. بە شێوەیەکی کۆنکرێتیانە: پێویستە هەڵوێستە ئازاد و عادیلەکانی ناوەڕۆکی گەردوونی ئیسلام سەبارەت بە تەواوی زیندووەکان، بەتایبەتیش سەبارەت بە جڤاتەکانی تایبەت بە

مرۆڤ پراکتیزە و جێبەجێ بکەین. ئەمە ئەو راستینەیە کە بە شێوەی زەوتنەکردنی مافی بەندەکان و پێ لێنەکردنی مێرووله باس کراوە.

بەڵام زەندیقەکانی "حزبوڵا" و "ئەلقاعیدە" و هاوشێوەکانیان کە سەرچاوەی خۆیان لە هەر دوو ناوەندی ستەمکار وەردەگرن، لە بنەڕەتدا نوێنەرایەتی فاشیزمی هەنووکەیی دەکەن کە نارەسەنێتی سەرمایەداری کردوویانن بە بەڵای سەر ئومەتی ئیسلام: لە رێگای لەسێدارەدان و کەللەپەڕاندنەوە فاشیزمێکی ترسناک لە دژی تەواوی گەلە موسڵمان و ناموسڵمانەکان پەیڕەو دەکەن، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەو فاشیزمە دژ بە گەلی کوردستان پەیڕەو دەکەن. لە کاتێکدا فاشیزمی میللیگەرایی ـ علمانی فاشیزمێکی دەوڵەتگەراییە کە دوێنێ و ئەمڕۆش بە شێوەیەکی بێبەزەییانە جێبەجێ دەکرێت، فاشیزمی ئیسلامی رادیکالیش کە گوایە رۆژانەییترە لە رێگای ئەو پارت و رەوتانەوە جێبەجێ دەکرێت.

هێژایان، خوشک و برایانی ئیماندار!

بزووتنەوەی ئازادی کوردستان هەرگیز ناکەوێتە ناو تەڵەزگەی ئەو گومڕاییەی سەرچاوەکەی بۆ ئەو دوو ناوەندە دەگەڕێتەوە و خۆیان بە شێوەی میللیگەرایی ـ علمانی و ئایینگەرایی رادیکال دەخەنە روو، لە هەمان کاتیشدا دەرفەتیان پێ نادات. لەو بڕوایەدام ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییەی نوێنەرایەتی دەکەین لە بەرامبەر هەموو جۆرە کردەوە و چەمکێکی لە جۆری میللیگەرایی، ئایینگەرایی، رەگەزگەرایی و بەناو زانستگەرایی تێکۆشان دەکات و دەبێتە خودی جوگرافیای ئازاد و دیموکراسی رادیکاڵ. مانای ئومەتی ئیسلامی هاوچەرخ "یەکێتی میللەتەکان" دەدۆزمەوە. وەلێ ئەمە هەرگیز مانای جەمسەرگیریەکانی "یەک دەوڵەت، یەک میللەت و یەک ئاڵا نابەخشێت"، بە پێچەوانەوە وەک پێویستیەکی مانای ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرمووێ "وجعلناکم شعوبا و قبائلا لتعارفوا" گوزارشت لە یەکێتی میللەتە ئیسلامیەکان دەکات کە ئازادیخواز، یەکسانیخواز، دیموکراسیخواز و فرەڕەنگە. لەو بڕوایەدام کە کۆنگرەکەتان بنەماکانی هەڵوێست و پراکتیکی راست سەبارەت بە کێشەی "تاکانە" (پاژە)یی مەزهەبەکان پێش دەخات؛ بێگومان ئەوەش لە چوارچێوەی ئەو تێڕوانینەی کە

مەزهەبـەکان بـە گوزارشـتی فرەلایـەنی دەبینێت و لـە چوارچێـوەی تاکانـەیـی و گەردونیبوونی ئیسلام تاوتوێی دەکات.

پێویستە بزووتنەوەکەمان لە ناو دوالیزمی ئایینی ـ علمانی نەخێنکێندرێت کە ئەنجامێکی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی خۆرئاوایە. بە بڕوای من تەنگەتاوکردنی خـودی ئیسـلامیش لـە چوارچێـوەی ئـایینی ــ عەلمانیـدا هـەڵـەیـە، تێکـدان و مایەپووچکردنی یەکپارچەیی ژیانە کە لە ئیسلامدا دەبینرێت. هـەروەها هاوشـێوەی مۆدا؛ پێناسـەکردنی پێوانەکانی ئیسلامیەت لەمیانی رووخسار و جلوبەرگەوە، جگە لـە هـەڵوێستی پۆزیتیڤیستی بەرتەسـک و سـنووردار گوزارشـت لـە هیچـی دیکـە ناکات. مسۆگەر ئەگـەر پێویسـتی بە ئەنجامدانی پێناسـەیـەکی گشـتی بـۆ ئیسـلامی هەنووکـەیی هـەبێت، لەبـەر ئـەوەی هـەر کـەس لـە خـۆوە دەگرێت بـە بـڕوای مـن دەستنیشـانکردنی بـە شـێوەی "ئیسـلامی کولتـووری" زیـاتر نزیـک بـە راسـتییە. مەبەسـت لـە ئیسـلامی کولتـووری کۆمـەڵگـای ئیسـلامە: هـەم ئـەو کۆمـەڵگایـەی بەرجەستە بووە، هەم ئەو کۆمەڵگایەی ماناکەی بەردەوامە. پێویستە لەبیر نەکـەیـن کاتێ ئیسلام لە دایک بوو، مەرجە رووکەشیەکان و شـێوەکانی پەرسـتن جێگـای باس نەبوون. یەکەمین گووتە "بخوێنە" بوو، واتـە پـەیوەسـت بـە مانـاوە بـوو. هـەر ئەوەش بنەما و بنەڕەتە. بە بڕوای من ئەو خاڵە بۆ رۆژی ئەمڕۆشمان لـە جێگـای خۆیدایە. سـەبارەت بە رۆژی ئـەمڕۆمان مانـای ئیسـلام، لـەو سـۆنگەوە پێناسـەی بکەین، جێگیرکردن و ژیانیکردنی پێوانەکانی دیموکراسی، ئازادی و دادپەروەرییە لە کۆمەڵگاکانی ئیسـلام کە راستینەیـەکی کۆمـەڵگـای ـ مێژوویـیە، لـەو پێناوەشـدا جێبەجێکردنی جیهادی ئەکبەر و جیهـادی سـۆغرایە، واتـە ژیانێکـە بـەردەوام لـەناو رەخنـە و رەخنەدانـدا بێـت. بـە گوتـەیـەکی تـر هەمیشـەییکردنـی شـەڕی نەفسـی (تێکۆشانی ناوخۆیی)یە لە بەرامبەر هێزەکانی خراپە (ئەو هێزانـەی کە لـە دەرەوە دێن).

باوەڕمەندانی هێژا و بەڕێز!

بە ئەندازەی مانای کۆنگرەکەتان کە هەوڵم دا ئاماژە بە هێڵە گشتیەکانی بکەم، بەردەوامی و بە دامەزراوەبوونی وەک ئـەرکێکی گرنگتـر لـە بـەردەممان وەسـتاوە. وەک سەرجەم وڵات و دەڤەرەکانی ئیسلام لە کوردسـتانیش بـە دژواری پێویسـتی بـە دەزگـا و دامـەزراوەبوونێکی نـوێ و بـەردەوامی ئیسـلام هـەیـە. تێپـەڕکردنـی جەماعەتـەکانی سـەر بـە شـیعەگەری، ئیخـوانی و سـەلەفییەکان کـە ریشـە و

سەرچاوەکەیان سوڵتەگەراییە و جگە لە ڤێرسیۆنەکانی سەرمایەداری جیهانگیری شتێکی تر نین، لەپێناو دامەزراوەبوونێکی نویێ مەرج و پێویستیەکە. هەڵبەتە ئیسلامی دیانەتی فەرمی چارە نییە. ئیسلامی دیانەتی فەرمی ئیسلامی خەسێنراوە، لە ئیسلامی نافەرمی زۆر بێماناترە، کاریکاتۆرێکی ئیسلامە کە خزمەت بە دژەکەی دەکات. لە فاشیزمەوە تا دەگاتە لیبرالیزم مەیدانگەلێکی فراوانی خزمەتکردنی هەیە. لەم واتایەدا رۆڵی دژەئیسلام دەبینێت. دواترین پراکتیکی ئەو ئیسلامەی لە تورکیا تاقی کرایەوە، ئینجا ئەمە ئیسلامی فەرمی بێت یان جەماعەت (ناسیاسی)، کۆمەڵگای رووبەرووی تالانکارترین، دوژمنی ژینگە و دەسەلاتگەراترین نموونەی سەرمایەداری هێشتۆتەوە. ئیسلامی دیموکراتیک، ئازاد و دادپەروەر ناچارە خۆی وەک ئەلتەرناتیڤی ئەو واقیعە پێناسە بکات و بەردەوام دامەزراوەبوونی خۆی پێش بخات. لەو بڕوایەدام کە بە ئیرادە و تێگەیشتنێکی قووڵەوە ناوی دامەزراوەبوونی نویێ، بنەماکانی رێکخستن و شێوەی هیواکانی پێک دێنن و ئاوای دەکەن.

وەک خاڵی کۆتایی، هەندێ کەس لەمیانی دەستەواژەکانی خۆرئاواوە دەخوازن بزووتنەوەکەمان وەک دژەدین، کۆمۆنیست و ماتریالیست پێناسە بکەن. ناوبردنی ئەو کەسانە بە "کۆیلەی دەستەواژەکان" گونجاوە و لە جێگای خۆیدایە. تەنیا ئاماژەکردن بەو خاڵە بەسە، ئەگەر سروشتی کۆمەڵگای ئیسلامی راستینە و واقیعێک بێت، ئەوە ناشێ موسڵمان باوەڕمەند یان دژەدین بێت. ئەوانە دەستەواژەی دروستکراون.

گەلێک کە لەژێر دژوارترین هەلومەرجدا رووبەرووی ئابلۆقەی سەرجەم سەرمایەدارە جیهانگیرییە زۆردارەکان بۆتەوە، لەژێر هێرشی پێشکەوتووترین تەکنۆلوژیاکانی شەڕدایە، هەر شتێکی تالان دەکرێت؛ بەڵێ شەڕڤانانی گەلی کورد کە دووچاری ستەم و چەوسانەوەی ئیسلامی ساختە هاتووە، جەنگاوەرانی ئەو کۆمەڵگایە تەنیا و تەنیا دەشێ قارەمانێتیەکی هاوشێوەی حەزرەتی عەلی شایستەیان بێت. هیچ گومانێکم لەو راستییە نییە کە نوێنەرایەتی دادپەروەرانەترین، ئازادیخواز و دیموکراسیخوازانەترین نەریتی ئایینی ئیسلام دەکەین. بێگومان بە ئەندازەی شایستەبوونی پێشەنگایەتی هاوبەشیکردنی رۆژانەیی ئەو راستینەیە لەگەڵ تەواوی گەلە مەزلوم و ستەملێکراوەکانی جیهان،

سەبارەت بە نوژەنبوونەوەش کە ئەمڕۆ و داهاتوو کردوویانە بە پێویستیەک بە بانگەشەترین بزووتنەوەین.

بوون بە سەنتێزی بزاڤێکی حوسەینی هاوچەرخ و سەلاحەدینی هاوچەرخ، گرنگترین بەختەوەرییە، لەو سۆنگەوە؛ سەرچاوەی باوەڕی و ئیمانە. هەمووتان بانگهێشتی هاوبەشێتی، ئیرادەبوون و چالاکی دەکەم. شانبەشانی بانگێشتکردنتان بۆ یەکێتی ئەڵڵا کە خۆی ناوی ئازاد و ئاسودەیی کۆمەڵایەتییە، هیوادارم لەناو ئارامی و ئاشتیدا بژین و دووبارە سڵاو و ڕێزی خۆمتان پێشکەش دەکەم.

٢٠١٤/٤/٢٤

زیندانی ئیمرالّی تیپی F

عەبدوڵڵا ئۆجالان

# کورد و نەریتی ئیسلامی

رێنسانی ئیسلامی کاریگەرییەکی وەرچەرخێنەرانەی لەسەر تەواوی کولتووری نەریتی قەبیلەی خۆرهەڵاتی ناوین و سیستەمی شارستانیەت کردووە. لەرێگای گۆڕانکارییەوە لەمیانی ئوممەتگەرایی ئیسلامەوە لەناوەوە هەوڵی تێپەڕاندنی قەیرانی کۆمەڵگای قەبیلە دراوە، لە دەرەوەش لەسەر بنەمای ئاواکردنی سەڵتەنەتی گەردوونی ئیسلامیەوە هەوڵی دەربازکردنی قەیرانەکانی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی و ساسانی دراوە. بەمجۆرەش دوو ناکۆکی ریشەیی لەئاستی تاکانەیی و گەردوونی لەمیانی سەنتێزی ئیسلامی و رێکخستنی بونیادی و ئایدیۆلۆژی نوێ هەوڵی دەربازکردنی دەدرێت. ئەو دیاردەی بە سیستەمی شارستانیەتی چاخی ناوین ناودەبرێت پێهەڵگرتنی ئیسلامی لە ژێریدا شاراوەیە. کاریگەرییە بەهێزەکەی نەریتی سەڵتەنەت و ئوممەتی ئیسلامی لە مێژوودا بۆ تایبەتمەندێتی ئەو سەردەمە نوێیە دەگەڕێتەوە. بەجۆرێک لەجۆرەکان رۆڵی مۆدێرنیتەیەکی سەرمایەداری پێشوەختی بینیوە. وەک بڵێی هەواڵی بەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆرئاوای ئەوروپایە، لە دۆخی منداڵە مردووە لەبارچووەکەدا ماوە. شارستانیەتی ئیسلامی نەبێت بیرکردنەوە یان چاوەڕوانی کردنی لەدایکبوونی شارستانیەتی ئەوروپا هەڵەیە.

کاریگەری ئیسلام لەسەر کولتووری نەریتی قەبیلە و سیستەمی شارستانیەت لەئاستی شۆڕش دایە. لەوانەیە بەکاریگەرترین وەڵامی شۆڕشگێڕانەی ئەو قەیرانە بێت کە بەسەدان ساڵ لە کولتووری قەبیلە لە ئارادابوو. قەبیلە عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی بەسەدان بگرە بەهەزاران ساڵ لە ناوەخۆیاندا کەوتبوونە ناو شەڕ و پێکدادانێکی بێکۆتاییەوە. خراپەکارییەکی مەزن لە کولتووری قەبیلە

روویدابوو. ژن بچووک دەبینرا و جێگای سووکایەتی پێکردن بوو، کیژۆڵەکان هێندە بێنرخ بوون زیندە بەچاڵ دەکران. وەک چارەسەریش ئەو کولتوورە لەو هەلومەرجانە بێ بەش بوو کە کۆمەڵگای کلاسیک تێر بکات. بەکورتی نە فیدڕاسیۆنەکانی قەبیلەی باو و نە بونیادە نەریتیەکانی دەسەڵاتی کۆیلەداری هیچ یەکێکیان ناتوانن قەیرانەکان بەربەست بکەن. پێشنیازە کرداری، ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانی حەزرەتی محەمەد لەو هەلومەرجەدا وەک دەرمان بەکاریگەر بووە.

سەرەکیترین خەسڵەتی شۆڕشی محەمەدی: بەبێ ئەوەی لەسەر کۆمەڵگای قەبیلەوە ببێتە کۆمەڵگایەکی نوێ و بکەوێتە ژێر فەرمانی ئیمپڕاتۆریەتەکانی بێزەنتی و ساسانی تەنیشتیەوە، بوێری سیستەمێکی سیاسی نوێی پیشانداوە کە هەردووکیان دەرباز دەکات و خۆیشی بۆ ئەو کارە گونجاو و دەسەڵاتدار بینیوە. ئەو دوو دیاردە شۆڕشگێڕییە، واتە کۆمەڵگابوونی ئوممەتی ئیسلامی و دۆگمای کولتووری سیاسی لەژێر شکۆدارکردنی رادەبەدەری دەستەواژەی ئەڵڵا شاراوەیە. کاتێک بەشێوەیەکی زانستیانە شیکاری مێژوویی و سۆسیۆلۆژی دەستەواژەی ئەڵڵا بکرێت بە بایەخە و رایەڵەکەی لەگەڵ ئەو دوو دیاردەیە ئاشکرا دەبێت. نەوەد و نۆ چەشنە مانای پەیڤی ئەڵڵا هەڵگرێتی، لەبنەڕەتدا ئاماژەیە بۆ مانیفستۆی سیاسی و کۆمەڵایەتی و بگرە ئابووریش. لە راستیدا کاتێک خۆی وک "پەیامبەر" پێناسە دەکات، ئەوا بەشێوەیەکی تۆکمە و بەهێز ناسنامە نوێیەکەی سەنتێزی کۆمەڵایەتی و مێژوویی پاشخانەکەی ئاشکرا دەکات. گەردوونی، ئاگادار بوون، زانایی، بەخشندەیی، ئاگادارکەرەوەیی لە رێگای خەڵاتەکانی بەهەشت و دۆزەخی دەستەواژەی ئەڵڵا وەک فەرمانێک ناسنامەی سیستەمی نوێ پێشکەش دەکات.

مانیفستۆی کۆمۆنیستی چی بێت کە مارکس و ئەنگلس نووسیویانە، قورئانی پیرۆزیش هەمان شتە کە "بۆ حەزرەتی محەمەد هاتۆتە خوارەوە". یەکەمیان تایبەت بە ئەورووپا و زانستی نووسراوە، دووەمیشیان لەمیانی کۆدی تایبەت بە خۆرهەڵات و ئایین راگەیەنراوە. دیاردەکانی بە کۆمەڵگای سۆسیالیستی و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ناودەبرێن لە ئیسلامیەتدا بەرامبەرەکانیان کۆمەڵگای ئوممەت و سوڵتەی ئیسلامییە. هەروەها سیستەماتیکی چەمکی سوڵتە (سەڵتەنەت) ی ئیسلامی لەچەمکی دیکتاتۆریەتی سۆسیالیستی کەمتر نییە. هەروەک هی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەردوو دیاردەش بەدرێژایی سەدان ساڵ بەشێوەیەکی سیستەماتیک هەوڵی پەرەپێدانی دراوە.

ئەو دوالیزمەی لەمێژووی شارستانیەت بەسەر هەر شۆڕشێکدا هاتووە بەشێوەیەکی بەهێز لە شۆڕشی ئیسلامیشدا روویداوە. ماوەیەکی کورت دوای ئەنجامدانی؛ ئاخۆ شۆڕش بەئاراستەی دیموکراتیدا دەچێت یاخود بە ئاقاری دەسەڵات ـ دەوڵەتدا دەچێت؟ بووە بە کێشەیەکی سەرەکی. هەر لەسەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامەوە هەردوو مەیلیش بەشێوەیەکی بەهێز دەرکەوتوون. لە کاتێکدا چینی سەرووی قەبیلە و ئارەزووخوازانی دەسەڵات هەوڵیاندەدا بەخێرایی ئیسلام بکەن بە سەڵتەنەت، توێژی خواروی قەبیلە و کۆیلەکان هەوڵێکی زۆریان دەدا بەئاراستەی دیموکراسیدا بچێت. چینی سەرووی قورەیشیەکانی قەبیلەی حکومڕان بەڕێبەرایەتی مەعاوییە هەوڵی داوە پێهەڵگرتنە دیموکراتیەکەی ئیمام عەلی بەربەست بکات کە زیاتر کارەکتەری چینی ناوینی هەبوو. بەهۆی ئەو ناکۆکیەی حەزرەتی ئەبوبەکر، عومەر و عوسمان لەگەڵ ئیمام عەلیدا هەیانبوو دوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد لە قۆناخی گوزەرکردندا (٦٥٦ـ٦٣٢زایینی) بە ریزە خەلیفایەتی (یاریدەدەری حەزرەتی محەمەد)یان وەرگرت. لەو قۆناخەدا ململانێیەکی بەهێز لەنێوان نەریتی (شەعبیە) دیموکراسی و نەریتی (سوڵتە) ی دەسەڵاتگەرادا روویدا.

ئەو ململانێ و پێکدادانە بەجۆرێک لەجۆرەکان یەکەمین نموونەی شەڕی ناوخۆیی ئیسلام بوو. بەپێچەوانەی مەزەندەکان رێبازی ئیمام عەلی (ئامۆزا و زاوای حەزرەتی محەمەد و یەکێک لە موسڵمانە یەکەمینەکان) چەپڕەوێکی رادیکاڵ، ئەوپەڕگەڕ یاخود دیموکراتیک نییە، بەڵکو بەشێوەی ئیسلامی میانڕەوی مام ناوەندە (وەسەت) ـە. خەواریجەکان نوێنەرایەتی دیموکراسی و رادیکالیزمی راستەقینە دەکەن. خەواریجەکان لەهەژارترین توێژی خێل و قەبیلەکان پێکهاتبوون. کاتێک لەدۆخی هاوسەنگی (رەوشی شەڕی صەفین)دا ئیمام عەلی بە کەوتنەگەری ناوبژیوانان رازی بوو، هەم رێگای لەپێش جیابوونەوەی رادیکاڵەکان (خەواریج)ی پشتیوانانی خۆی کردەوە و مەزهەبێکی نوێیان ئاواکرد (یەکەمین پێکهاتەی مەزهەبی)، هەم رێگای لەپێش حیساب و لێکدانەوە لێزانیەکەی مەعاوییە بۆ دەسەڵات کردەوە. لە ئاکامدا لایەنگرانی دەسەڵات سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. لەسەردەمی سەرکەوتنی ئیسلامەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان ئەو سێ رەوتە سەرەکییە لەمیانی ناوەڕۆک و ناوی جیاوازەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتوون، بەدرێژایی مێژووی خۆیان گێڕاو و بازنەیەکی نەزۆکیان بەسەر کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی

ناویندا سەپاندووە کە بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانە خۆی دووبارە دەکاتەوە؛ ڕێگایان لەپێش شەڕە گەورەکانی دەسەڵات، پێکدادانە خوێناویەکانی خانەدانەکان، شەڕی مەزهەبی و جیاوازی باوەڕی کردۆتەوە. سەرەنجام؛ لەسەر بنەمای دەوڵەتۆکە دەسەڵاتگەراکان، ئیمپڕاتۆر، مەزهەب و تەریقەتە لەژمار نەهاتووەکان گوزەرکردن بووە لەقەیرانی کۆمەڵگای قەبیلەوە بۆ قەیرانێکی سەختتری کۆمەڵگا (ئومەت)ی ئیسلامی. ئەو راستییە مێژووییە لەژێر دۆخی ئێستای خۆرهەڵاتی ناویندا شاراوەیە کە بەرامبەر هەژموونگەرایی سەرمایەداری خۆرئاوا دووچاری شکستی قورس هاتووە و لەناو قەیرانێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەریدا دەژیت و بەرگەگرتنی ئەستەمە.

بوونی کولتووری کوردانیش بەدژواری کەوتە ژێر کاریگەری قەڵەمبازی ئیسلامیەوە کە لەتەنیشتیەوە روویدا. زیاتریش دووچاری وێرانکاری ئیسلامی سەڵتەنەت هات. لەمیانی شەڕە خوێناویەکانی فەتحکاریەوە کە خانەدانێتی ئەمەوی و رژێمی سەڵتەنەت بەشێوازێکی هاوشێوەی فەتحکاری و وێرانکاری ئەسکەندەر ئەنجامیدان لەماوەیەکی کورتدا خاکی کوردانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بەتایبەتیش فەرماندە زۆردارەکانی وەک حەجاج تەواوی ئەو کوردانەی کۆمەڵکوژ کرد کە دەستیان شمشێر دەگرێت و بەکۆمەڵ دەستیان بەسەر ژنان و منداڵەکانیاندا گرت. هێندەی زانراوە یەکەمین نموونەی ئەو شێوە داگیرکاریەی کوردان لەمێژوودا دووچاری هاتوون ئەو شالاوەیە کە بۆتە بابەتی داستانی گلگامێش و لە باکووری ئێراق و دەڤەرە شاخی و دارستانیەکەی خۆرهەڵات گلگامێش لەگەڵ ئەنکیدۆی بەکرێگیراوی ئەنجامیانداو خوێنیان رژاند (ئەو درندەیەی دەکوژرێت و ناوی خومبابەیە لەبنەڕەتدا پێویستە وەک سەرۆک قەبیلەیەک ببینرێت). هەڵوێستی کوردان بەرامبەر بە ئیسلامی سەڵتەنەت بەشێوازێک بووە کە لەقووڵاییەوە ڕێگای لەپێش دوالیزمێک کردۆتەوە. لەگەڵ دۆڕاندن و هەڵوەشاندنەوەی ئیمپڕاتۆریەتی ئێران ـ ساسانی پلەداری نەریتی خێڵەکان کە پێیانەوە گرێدراو بوون، لەپیشاندانی دڵسۆزی بۆ سەردارە نوێیەکانیان درەنگ نەکەوتن. دەستەی کوردە بەکرێگیراوەکان کە بەردەوام بیر لەنۆکەرێتی بۆ سەردارەکەی دەکاتەوە، بەپێی بەسەرچوونی کات سەرەتا لەگەڵ خانەدانێتی ئەمەوی بوو بەیەک، دواتریش لەمیانی ئاسیمیلاسیۆنی ئارەزوومەندانەوە بوون بە عەرەب.

چیرۆکی بەعەرەببوونی نوخبەی کوردی بەکرێگیراوی دەسەڵات زۆر سەیرە. ئەو توێژەی کە هەزاران ساڵە رێککەوتنی لەگەڵ کولتووری ئیمپراتۆریەتی ئێرانی هەبوو لەبواری ئەتنیکیشەوە لێک نزیک بوون و تارادەیەکی زۆر هەبوونی زمان و کولتووری خۆیان لەناودا پاراستبوو هەڵبژاردنی بەعەرەببوون لەنزیکەوە گرێدراوی پێکهاتەی چینایەتییانە. بەر لە عەرەببوون سەرکردەکانی پلەداری کورد هێشتا پەیوەندییەکی نزیکیان لەگەڵ کولتووری قەبیلەدا هەبوو، ئەندامی هەمان قەبیلە و خێڵ بوون. هەربۆیە جیاوازی چینایەتی لاوازە. لە جیابوونەوەی چینایەتی زیاتر بەرژوەندیەکانیان و مانەوەیان وەک چینی سەرووی پلەداری ناو قەبیلە و خێڵ بەکەڵک و پێویست دەبینی. لەدەستدانی رایەڵە کولتوورییەکانی خێڵ و تەنیا وەک تاک یاخود بنەماڵە توانەوەیان لەناو کولتووری خانەدانێتی حکومڕانی بیانی بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان نەبوو. لەدۆخێکی بەمجۆرەدا لەوانەیە هەموو شتێکی خۆیانیان لەدەست دابووایە. چەندین نموونەی مێژووییان لەبەرچاو بوو کە ئەو مەسەلەیان دەسەلماند. راستینەی قەبیلە و خێڵی کورد بەشێوەیەکی زۆر وشک پابەندی کولتووری خۆیەتی، هەر بۆیەش ئاوێتەبوون لەگەڵ هێزە دەرەکیەکان و ئاسیمیلاسیۆنی ئەستەم بوو یاخود کردبوو بەحاڵەتێکی دەرئاسا. لەگەڵ ئەوەش پێنەگەیشتنی هەلومەرجی ماددی جیابوونەوەی چینایەتی و گرنگترینیشیان تێکۆشانی بەردەوامیان بەرامبەر فەتحکار و داگیرکارە دەرەکییە چەوسێنەرەکان رۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە.

لەسەردەمی داگیرکاری خانەدانی ئەمەوی عەرەبی هەم لەبواری مێژوویی هەم کۆمەڵایەتی جیاوازییەک جێگای باس بوو. لەگەڵ زاڵبوونی سەڵتەنەتی ئیسلامی چینی سەرووی قەبیلەی عەرەب، لە چینی خوارووی قەبیلە دابڕاو بەخێرایی بوو بە چینێکی نوێی دەسەڵاتدار. جیابوونەوەیەکی چینایەتی قووڵ جێگای باس بوو. لەسەردەمی ئەمەویەکاندا ئەرستۆکراسیەکی بەهێزی عەرەبی - ئیسلامی پێکهاتبوو. بۆ یەکەمین جار لە کولتووری خۆرهەڵاتی ناوین چەشنێک پەیوەندی نوێی لەجۆری بەگ (مەوالی ) - جووتیار (مسکێن) پێکهات کە پەیوەندی باوی سەردار - کۆیلە دەرباز دەکات و لە پەیوەندی دەرەبەگ - بەندە دەچێت کە دواتر لە ئەورپا سەرهەڵدەدات. بە بەراورد لەگەڵ کۆیلایەتی کلاسیک پێکهاتنی پەیوەندیەکی چینایەتی نەرمتر گرنگترین بەرهەمی سوڵتەی ئیسلامییە. سیستەمی نوێی چینایەتی دەسەڵاتی ئیسلامی جێگای باسە. ئەو هێزەی پێشەنگایەتی ئەو

پڕۆسەیە دەکات خانەدانی ئەمەوییە. لەپێناو خزمەتکردن لەماوەیەکی کورتدا خانەدانی ئەمەوی کۆشکەکانیان پڕ لە بیروکرات و نۆکەرە چینایەتیەکانی پاشماوەی ساسانی و بێزەنتی دەکەن. چینی سەرووی سەرجەم ئەو کولتوورانەی فەتحیان کردوون ئەو جیابوونەوە چینایەتییە کۆمەڵایەتییە مێژووییە تا دوا رادە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان دەبینن، ئەگەر لەسەر بنەمای بەکرێگیراوێتیش بێت بەخێرایی دەبن بە ئەرستۆکرات. ئەمانە پەیوەندییەکی زۆری هاوسەرگیرییان لەگەڵ ئەرستۆکراسی خانەدانی فەرمانڕەوا بەست. منداڵەکانیان بە زمان و کولتووری فەرمی عەرەبی پەروەردە کرد. ئەو جارە زۆر بەخێرایی لەزمان و کولتووری قەبیلەی خۆیان دوورکەوتنەوە. ئەو دۆخەی جاران لەگەڵ بەرژەوەندیەکانیاندا ناکۆک بوو، تا دوا رادە لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکانی ئەرستۆکراسی ئیسلامی گونجاو بوو. لەراستیدا زۆر جار نموونەی هاوشێوە لەمێژوودا روویدا بوو.

هەزاران ساڵ بەر لەزمانی عەرەبی زمانی فەرمی ئەکەدی، ئارامی و سوریانی زمان و کولتووری هاوبەشی ئیمپراتۆریەتەکان بوون. لەمێژبوو ئەو رۆڵەیان دەبینی کە زمانی گریکی و لاتینی لە خۆرئاوا دەیانبینی. بۆ یەکەمین جار بوو لەرێگەی ئیسلامیەتەوە زمانی عەرەبی وەک زمانی هاوبەش و بەربڵاوی کولتووری خۆرهەڵاتی ناوین هەڵدەکشا، کولتووری خانەدانێتیش بە زمانی عەرەبی گوزارشت دەکرا و دواتر دەبوو بە کولتووری هاوبەشی ژیانی سەرجەم ئەرستۆکراسی ئیسلامی خۆرهەڵاتی ناوین. وەک بڵێی بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراسی تازە هەڵکشاوی خۆرهەڵاتی ناوین نەمابوو بنەچەی خۆی بە خانەدانێتی عەرەب نەبەستێتەوە. هەر بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی بەکرێگیراو گرنگیەکی تایبەتی بەو خاڵە دەدا کە بنەچەی خۆی بەخانەدانێکی عەرەب ببەستێتەوە، بەتایبەتیش ئەهلی بەیت. پێویستە چینی سەرباز و زانا نوێکانیش بخەینە سەر ئەو کاروانەوە. هەموویان نکوڵیکردن لە بنەچەی کۆنیان و هەڵگرتنی نازناوی سولالەی نوێیان بۆخۆیان کرد بە نەریتێک. بگرە کولتووری هەزاران ساڵەی فارسیش لە ئاسیمیلاسیۆنێکی خەستی ناو زمان و کولتووری عەرەبی رزگاری نەبوو. زمان و کولتوورە لاوازەکانیش زۆر بە ئاسانی قووتدران. لەکاتێکدا زمانی ئەکەدی کۆن بە تەواوی گرنگی خۆی لەدەستدا، زمانەکانی ئارامی و سوریانیش زۆر لەهێزی خۆیانیان لەدەستدا.

چینی سەرووی خێڵ و قەبیلە کوردەکانیش پشکی خۆیان لەو ئاسیمیلاسیۆن و ئاوێتەبوونە خێرایە وەرگرت. بەردەوامکردن و درێژەپێدانی نەریتی کۆنی زەردەشتی لە سوود زیاتر زیانی پێدەگەیاندن. سووربوون لەسەر ئەو کولتوورە مانای لەدەستدانی بوونیان بوو. دوای قۆناخێکی کورتی بەریەککەوتن بەخێرایی پەسەندکردنی توانەوە لەناو زمان و کولتووری بیانی کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی چینە دەسەلاتدارەکان لەمێژوو تێیدا بەهرەدارن، پێویستیەکی بەردەوامکردنی بوونیان بوو. لەماوەی نێوان سەدەکانی ۷ ـ ۱۰ ی زایینیدا چینێکی سەردەستی بەکرێگیراوی کوردی زۆر بەهێز پێکهات کە لەناو زمان و کولتووری ئەرستۆکراسی عەرەبی توایەوە و لەگەڵیدا ئاوێتە بوو. هەرچەندە ئەو توێژانە لە رووخساردا بە کورد دابنرێن، بەڵام لەبواری زمان و کولتووردا هەریەکەو بەندەیەکی زمانی فەرمی عەرەبی بوون. ژیانیان لەگەڵ ئەو زمان و کولتوورە نوێیە بە هێمای نوخبەیی دادەنا و شانازییان پێوە دەکرد. ئەو توێژانە کەسانێک بوون کە بەر لە هەر کەسێکی دیکە دەستبەرداری زمان و کولتووری خۆیان بوون. تا ئێستاش پاشماوەیەکی بەهێزی ئەمانە لە کوردستان ماوەتەوە.

ئەرستۆکراسی بەکرێگیراوی کوردان کە رۆڵی دەسەلات دەبینێت لەبواری مەزهەبی پابەندی نەریتی سوونییە. لەبواری واتادا سوونیی بوون گوزارشت لە ئیسلامیبوونی رواڵەتیانەی نەریتی چینی سەرووی پلەداری قەبیلە دەکات. ئیسلامی سوونني ئیسلامی زاڵ و دەسەلاتگەرایە. بناخەیەکی بەهێزی چینایەتی هەیە. پەسەندکردنی سونیگەرایی لەلایەن زۆرینەی میرنشینە کوردەکانی چاخی ناوین پێویستییەکی بەرژەوەندییەکانیان بوو؛ لەبواری پەیوەندی ئیسلام بە حەقیقەتەوە هیچ واتایەک نابەخشێت. دەکرێ بگووترێت سوونیگەرایی شێوەی دەمامکدراوی باوەڕی ئەو دەستە و گرووپانەیە کە بە بەرژەوەندیخوازی و دەسەلاتی رووتی ئیسلامەوە سەرقاڵن. ئەو گرووپانە چەندین رەفتار و کردار لەژێر ئەو دەمامکەدا ئەنجام دەدەن کە لەناواخنەوە لەگەڵ ئەخلاق و ویژدانی کۆمەلایەتی ئایین ناگونجێن، بگرە لەگەڵیشیدا دژن. رۆڵی دەمامککردنی بەکارهێنان، ستەم و تەڵەکەبازیەکانی کۆشکی سوڵتانەکان بە ئیسلامی سونني بەخشراوە. نموونەکانی کۆشکی ئەمەوی، عەباسی و عوسمانیەکان لەو بارەیەوە تابلێی فێرکەر و وانەبەخشە. نکوڵیکردن، بێرێزی و بەربەستکردنی گەشەکردنی بوونی کولتووری کوردان لەلایەن زۆربەی زۆری کوردە بەکرێگیراوەکانی میرنشینەکانی چاخەکانی

ناوین تا دەگاتە پاشماوە کەسی و بنەماڵەییەکانیان لەرۆژی ئەمڕۆماندا گرێدراوی کارەکتەری چینایەتی، بونیادی دەسەڵاتگەریتی و ئایدیۆلۆژییانە. شێوازی نەشونمای بونیادی و ئایدیۆلۆژی چینێک کاریگەریەکی قووڵ لەسەر بوونی یەکپارچەیی کولتووری کۆمەڵگا جێدەهێڵێت. شێوازی نەشونمای چینی دەسەڵاتداری عەرەب، فارس و تورک لەلایەن ئیسلامەوە پەیوەندی ئەو توێژانەی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی خۆیشیان دەستنیشان کردووە. بەو رادەیەی بەکرێگیراویتیان سنووردار بێت هێزە دەستپێشخەرەکانی دەسەڵات پێکبێنن، بەلایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە کاریگەرییان کردۆتە سەر کولتووری کۆمەڵگاکەیان. وێڕای ئەوەی رادەی ئاسیمیلاسیۆنیشیان کەمترە، بەڵام سەرکوتکردن و چەوسانەوەیەکی دژوارتریان بەرامبەر چینەکانی خوارەوە بەڕێوەبردووە. دەسەڵاتدارانی کوردیش کە لایەنی بەکرێگیراویتییان لەپێشترە لەکاتێکدا بۆ ئاسیمیلاسیۆن لەبارترن، دەسەڵاتێکی لاوازتریان لەسەر بوونی کۆمەڵگای کورددا ئاوا کردووە. لاوازی دەسەڵات و تایبەتمەندێتی گونجاویان بۆ ئاسیمیلاسیۆن وایکردووە بەرامبەر بە زمان و کولتووری کۆمەڵگاکەیان نکوڵیکار و بێکەڵک بن. ئەو مەیلەیان لەرۆژی ئەمڕۆماندا ئاسیمیلاسیۆنی تێپەڕکردووە و بە ئاستی بەکرێگیراوێتیەک گەیشتووە کە تا ژینۆسایدی کولتووری هەڵکشاوە. بوونە بە بوونەوەرێک کە وەک مۆرانە لەسەر کڕاندن و کرتاندنی کۆمەڵگای خۆیان دەژین.

دووەمین مەیلی بەرامبەر شۆڕشی ئیسلامی هەڵوێستی دیموکراسییە. چۆنیەتی پێشوازیکردنی کوردان بۆ ئیسلام بەشێوەیەکی یەکپارچە نەبووە. وەک چۆن هەڵوێستی کوردانی شاخ و دەشت لەیەکتر جیاوازبوو، هەڵوێستی چینەکانی سەروو و خوارووش لێکجیاواز بووە. زانا زەردەشتی و قەبیلەکانی لە بەرامبەر یەکەمین گورزەکانی فەتحکاری ئیسلام رادەست نەبوون، هەروەک بەردەوام لەمێژوودا روویداوە بۆ بەرزایی و قووڵایی شاخەکان هەڵکشاون و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامییان بە بەرخودانەکانیان داوە. ئەو توێژە سەرەکیانەی بەرخودانەکانیان رادیکاڵ و هەمیشەیی بوو واتە زەردەشتی و عەلەوییەکان؛ یان ئیسلامێکی دژ بە ئیسلامی سوونەیان هەڵبژاردووە یان هیچ نەبوون بە ئیسلام. لەشوێنە شاخاویەکانیشدا دەرکی پێدەکرێت کە عەلەوێتی کولتووری باوەڕی توێژی رادیکاڵە کە بەرگری لەبوونی کولتووری بەرخودانی نەریتی خۆی دەکات، ئاسیمیلاسیۆن بە کفر دادەنێت و بەڕادەی گونجانی لەگەڵ بوونی کولتوورییان ئیسلامیان پەسەند کردووە. ناشێت عەلەوێتی بەتەواوی بە کولتووری ئیسلامی

دابنرێت. کولتوورێکە کە پابەندی کولتووری قەبیلە و خێڵی خۆیەتی، نەک لەبەر هەندێکی دیکە بەڵکو بەو رادەیەی لەگەڵ کولتووری خۆیان بگونجێت هەندێک بەهای ئیسلامییان لەپێناو خۆیان ئاسیمیلەکردووە و هەرسیان کردووە. لەبەر ئەو تایبەتمەندییانەش مایەی تێگەیشتنە کاتێک لێکچوونیان لەگەڵ بوونی زمان و کولتووری خورییەکانی پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا جێگای باس دەبێت. بەرخودانی بەردەوامیان بەرامبەر داگیرکارییە دەرەکییەکان و کولتووری توندوتۆڵی ژیانی قەبیلەگەری پێویست بۆ شاخەکان ئەو ئەنجامەی خولقاندووە.

رەوشی زەردەشتییەکان جیاوازترە. ئەمانە زیاتر لە رەهەندی ئاییندا بەرخودانیان کردووە نەک قەبیلەیی. بوونی ئایینی لەسەرووی بوونی قەبیلەییەوە بینراوە. بەشێوەی چەند مەزهەبێک توانیویانە تارۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بن. بە بەراورد لەگەڵ کوردە سونییەکان نوێنەرایەتی بەها پەتی و سافەکانی کوردێتی دەکەن. وێڕای ئەوەی لەمێژوودا دووچاری چەندین کۆمەڵکوژی هاتوون، بەڵام داکۆکییان لەسەر باوەڕی خۆیان کردووە. سەرباری ئەوەی سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی کولتووری نەریتی کوردن، بەڵام سووتاندنی پەرتووکەکانیان و سەرکوتکردنی بەردەوامی ژیانی ئازادیان رێگای لەپێش هەژاری ئەو سەرچاوە دەوڵەمەندە و وشک بوونی کردۆتەوە.

تەریقەتە سۆفیگەراکانیش وەک مەیلێکی بەرخودانی کوردانی دەشت بەرامبەر بە ئاسیمیلاسیۆن دەبینین. سۆفیگەرایی گوزراشت لە ئیسلامی باتینی دەکات کە رەهەندەکانی دەرەوەی ئیسلامی دەوڵەت ـ سوڵتە و لایەنەکانی ئەخلاقی و ویژدانی لەخۆوە دەگرێت کە لەقوڵاییەوە دەرکی پێکردووە. بە واتا گشتیەکەی گوزراشت لەو ئیسلامە کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگایی)یە دەکات کە لەگەڵ دەوڵەت نەبۆتە یەک، لەدەسەڵات خۆشنود نییە، خوازیارە لەمیانی هوشیاری، هەست و ویژدانی کەسێتیەوە ئایین بژێنێت. دابەشکردنی ئیسلام بۆ دوو کۆمەڵ یان پۆلینی لەجۆری ئیسلامی دەسەڵاتگەرا ـ دەوڵەتی و ئیسلامی کۆمەڵگایی لەگەڵ راستی کۆمەڵگای مێژووییدا دەگونجێت. ئیسلامی کۆمەڵگایی تەنیا بەشێوەی سۆفیگەرایی دەتوانێت بژیت، رێکخستنە بەرفراوانە گەلەریەکانی بەشێوەی تەریقەتیش ئەو راستیە پیشان دەدەن. ئیسلامی کۆمەڵگایی گرێدراوی دیموکراسییە. تەسەوف کە رێکخستنێکی ئیسلامی کۆمەڵگاییە لەبەرامبەر ئەو ئیسلامەی بەخێرایی بووە بەدەسەڵات (دەشێت بە ئانتی ـ ئیسلامیش ناوببرێت) شێوەیەکی پەناگە و پشتیوانی گەلە.

کۆمەڵگای ئیسلامی لەگەڵ ئیسلامی فەرمی دەسەڵاتگەرا جێگای باس نابێت، بەڵکو دەشێت لەمیانی تەریقەتە سۆفیگەریەکانەوە بەدیبێت و بژیت. هەروەها پۆلێنی ئیسلامی کەسی (تاکەکەسی)ش جێگای باسە. ئیسلامی کەسی ئیسلامی رۆحانییە؛ گوزراشت لە تێگەیشتنی تاک بۆ خوداوەندێتی دەکات. مانایەکی دیاری هەیە. بەڵام ئەو ئیسلامەی کە گرەو لەسەر دەسەڵات دەکات لەناوەڕۆکە کۆمەڵگاییە قووڵەکەی خۆی دابڕاوە و کەوتۆتە پێگەی دژیەوە.

هەبوونی رەوتەکانی تەسەوف بەشێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا لەناوەڕۆکدا گرێدراوی پەیوەندی خراپی کوردانە لەگەڵ دەسەڵاتدا. بنەچەی کوردێتی زۆرێک لەدامەزرێنەرانی تەریقەتە تەسەوفییەکان پەیوەندی بە راستینەی کۆمەڵگاکەیانەوە هەیە. تەریقەتەکان بەجۆرێک لەجۆرەکان رێکخستنەکانی بەرگری خۆیی گەلن. ئەو رۆڵەی سەندیکاکانی چینی کارکەر بەرامبەر بە دەسەڵاتی سەرمایەداری بینیویەتی، لە چاخەکانی ناوینیشدا تەریقەتەکانی تەسەوف رۆڵێکی هاوشێوەیان لەناو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناویندا بینیوە. هەم رۆڵی رێکخراوە دیموکراتیەکان، باوەڕی و هزر، هەم رۆڵی رێکخراوەکانی ئابووری و بەرگرییان بینیوە. زۆرجار بۆ رێکخراوی سیاسی گۆڕاون، ئەو وەرچەرخانەش هەندێک جار شێوێنراوە و رێگای لەپێش بونیادی نوێی دەسەڵات و دەوڵەت کردۆتەوە. ئیسلامی کۆمەڵگایی بەلانی کەم هێندەی ئیسلامی دەوڵەت بەکاریگەر بووە. پێویستە ئیسلامی کەسیشی بخرێتە سەر. جیاوازی ئیسلامی کەسی لەگەڵ ئیسلامی دەوڵەتی و ئیسلامی کۆمەڵگایی ئەوەیە کە بەشێوەی ئایینی شەخسی و ویژدان دەژێنرێت. ئەستەمە ئیسلامی دەوڵەت بە ئایین بژمێردرێت. بۆ بەدەستهێنانی مەشروعیەتی رەفتارەکانی دەوڵەت لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، یاسایی و ئابووری بەکاردەهێنرێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئایا دەوڵەت ئایین بەکاردێنێت یاخود ئایین دەوڵەت بەکاردێنێت. ئەگەر دەوڵەت ئایین بەکاربێنێت، واتە ئەو ئایینە ناسنامەی خۆی لەدەست داوە، چونکە ناوەڕۆکی ئایین بەردەوام پەیوەست بەکۆمەڵگایە. لەگەڵ ئەوەی بەکارهێنانی دەوڵەت لەلایەن ئایینەوە جیاوازترە بەڵام دەچێتە سەر هەمان رێچکەوە. کاتێک چەرخێکی بەرفراوانی حکومڕانی وەک دەوڵەت دەکەوێتە ژێر فەرمانی ئایینەوە ئەوا دەبێتە هۆی مەترسیەکی گەورەتر. بەجۆرێک لەجۆرەکان فاشیزمی چاخی ناوین دێتە ئاراوە. سنووردارکردنی ئایین بەکایەی کۆمەڵایەتی و هێشتنەوەی بۆ بژاری ئازادی تاک لەگەڵ تایبەمەندێتیەکانی دەرکەوتنی گونجاوترە.

دەشێت بگووترێت کە ئایین لەو سێ بوارەی چالاکی کۆمەڵگای کوردەواریدا ڕۆڵی بینیوە. ئیسلامی دەوڵەت یاخود دەوڵەتی ئیسلام فەرماندەر و ئانتی دیموکراتە. مەشروعکردنی ئایین بەدەستی دەوڵەت یان مەشروعکردنی دەوڵەت بەدەستی ئایین، هۆکاری سەرەکی محافەزەکاری ئایین و بێکاریگەرکردنی ئایینە. هەر لەبەر ئەو هۆکارە سەرەکییە کە ئیسلام لەکۆمەڵگای کوردەواریدا بەکاریگەرە. لەبەرامبەر دەوڵەتدا جۆرێک لە بەرگری خۆیی دەستەبەر دەکات. بوونی کوردستان بە لانکەی زۆرێک لە تەریقەتەکان لە قووڵاییەوە پەیوەندی بە بەرگری خۆییەوە هەیە. هەرچی ئیسلامی کەسی (تاکەکەسی)یە بەرامبەر ئەو بێ متمانەییە قووڵەی لەناو کورداندا هەیە کاریگەرییەکی مۆڕاڵی هەیە. تا سەردەمی دەرکەوتنی کاریگەرییەکانی ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە کوردستاندا، ئیسلامیش شێوەیەکی کولتووری کۆمەڵگایە کە بەلانی کەم هێندەی کولتووری ئەتنیکی قەبیلە ڕۆڵی بینوە. هۆکاری سەرەکی دروستبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی سەرووی پەیوەندییە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانە.

هەر سێ ئایینە تاکخودابیەکان لە خۆرهەڵاتی ناوینی چاخی ناویندا ڕۆڵێکی گرنگییان بینی لەپێکهاتنی پەیوەندی و رایەڵە کۆمەڵایەتیەکانی سەرووی قەبیلە و خێڵ. پەرەپێدانی ئەو رایەڵە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی قەبیلە و خێڵ دەرباز دەکەن مانایەکی گەورەی شۆڕشگێڕی دەبەخشێت. ئەو گۆڕانکارییە مانای لەدایکبوونی کۆمەڵگایەکی نوێیە. ئوممەت(ألامە)ی یەهودی، مەسیحی و ئیسلامی مانای ئاواکردنی ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە ڕێکخستنەکانی قەبیلە و خێڵ دەرباز دەکات. ئەو دیاردەیەی لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی بەرجەستە دەردەکەوێت راستی گەل و میللەت (الملە)ـە. لە پێکهاتنی پۆلێنکردنەکان (کاتەگۆریەکان)ی گەل و میللەتدا ئایینەکان ڕۆڵی کارای یارمەتیدەریان بینیوە. بەجۆرێکی دیکە کۆکردنەوە و یەکگرتنی قەبیلە و خێڵەکان لەژێر ناسنامەیەکی سەرووددا زۆر زەحمەتە. ئەو ڕۆڵە بچووک ناکرێتەوە کە ئایین لە سەرخستنی ئەو هەوڵەدا بینیویەتی. گەلبوون و میللەتبوون دیاریکەرترین تایبەتمەندێتیەکانی چاخی ناوینن. وەک چۆن چاخی نزیک سەردەمی زەقبوونەوەی نەتەوەبوونە، چاخی ناوینیش سەردەمی زەقبوونەوەی پێکهاتەی گەل و میللەتە. بە بەراورد لەگەڵ دەستەواژەی گەل، میللەت دەستەواژەیەکی نزیکتر بە ئایینە و قەبیلە و خێڵ دەخاتە پلەی دووەمەوە و جەماعەتی ئایینی دەکات بەخاوەنی قسەو بڕیار. گەل

مانـای قـەومی ئـەو قەبیلـە و خێڵانـە دەبەخشـێت کـە لـەژێر کاریگـەری ئـایینی تایبەتمەنـدێتی ئـەتنیکییان بەدەسـتهێناوە. هـەرچی میللەتـە گوزارشـت لـەو کۆمەڵگایانەی ئوممەت دەکات کە ئایین مۆرکی خۆی لێداوە، لەسـەرووی قەبیلە و خێڵـەوە پێکهـاتووە و زمانیـان جیـاوازە. دەشـێت ئوممـەتێکی ئیسـلامی لـەمیانی کۆمـەڵێـک میللـەت نوێنەرایـەتی بکرێـت. باسـکردنی تاکـە میللـەتێکی ئیسـلام دەستەواژەیەکی زۆرەملێیانەیە. ئەو خاڵە بۆ کریستیانی زیاتر لەجێگای خۆیدایە. میللەتبوون زووتر لە کریستیانی دەستی پێکردووە. لە یەهودیەتیشدا لەگەڵ ئەوەی میللەت ی سەرەکی یەهودییە، بەڵام بەدەگمەن میللەتی دیکەش دەبینرێت.

میللەتی سەرەکی کە لەرێگای ئیسلامەوە هەڵکشان عەرەبەکان بوون. دوای عەرەبەکان فارسەکانیش لەمیانی ئیسلامی شیعەوە وەک میللەتێک بەدەرکەوتن. تورکەکانی لەریزی سێیەمدا دێن لەگەڵ سەدەی دەیەم وەک قەوم و میللەت بەدیار کەوتن. وێڕای ئەوەی کوردان وەک چوارەمین گەورە میللەت بەدەرکەوتن، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سێ میللەتەکەی تر لەپێگەیەکی دواکەوتووتردا مانەوە. ئەوەش مەسەلەیەکە پەیوەندی بەدەوڵەتبوونەوە هەیە. وەک چۆن نەتەوەکانی ئەوروپا (ألأمـم ألأوروبیـة) لـەدەوری دەوڵـەتی سـەرمایەداری بـەهێز بـوون و بوونەتـە نەتـەوەی دەوڵـەت، بەدەوڵـەتبوونی بەرەبابـەکانی قەبیلـەکانی عـەرەب، فـارس و تـورکیش وایکـردووە بـبن بـە میللـەتێکی پێگـەیشـتووتر. کـوردان کـە لـەئاواکردنی دەوڵەتـدا لاواز بـوون بـەهۆی ئاسیمیلاسـیۆنە خەسـتەکەی چینـی سـەروو وەک میللەت بێهێز بوون. میللەتی دەوڵەتی تەنیا بۆ چینی سەروو گرنگە. ئەوەی بۆ چینەکانی خواروو گرنگترە لەدەوری تەریقەتە سۆفیگەراییەکان وەک گەل شێوە بگرن و فۆڕم بەدەست بهێنن. دەوڵەت لە میللەتبووندا، جەماعەتی سۆفیگەراییش لە بەگەلکردن (ألتحول ألی شعب) بەکاریگەرترە. سەرەڕای ئەوەی کوردان خاوەن راسـتینەی میللـەتێکی لاوازی تـەوەرەی دەوڵـەتن، بـەڵام لـەدەورەی تەریقەتـە سـۆفیگەراییە بـەهێزەکان راسـتی گـەلبوونێکی دیمـوکرات، ئـازاد و یەکسـانتریان جێگـای باسـە. پێویسـتە ئـەوەش بڵێـین؛ کـە لەسـەردەمی ئیسـلامیەتدا کـوردان لـەدەوری میرنشـینی بـەهێز و تەریقەتـە سـۆفیگەراییەکان بەتـەواوی لـەرێگای میللەتبوون و گەلبوون دوانەکەوتوون. لەگەڵ ئەوەی جیاوازی لەنێوان میللەتبوونی چینی سەروو و گەلبوونی چینی خواروو هەیە، بەڵام پێویستە زلی نەکەین.

دیاردەی بەگـەلبوون کـە لـەئاکامی دەرکـەوتن لـە کولتـووری قەبیلـە و خێڵـی کورد بەدیهات بەکرمانج ناودەبرێت؛ ئەمەش مانای "مرۆڤی کورد"ە. لای تورکەکان

تورکمان، عەرەبەکان بەدەوی، لای ئێرانیەکانیش عەجەم هەمان مانا دەبەخشن. ئەگەر کرمانج لەتەواوی رایەڵە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانیش دانەماڵدرێت، بەڵام پۆلێنێکە بەهۆی پەرەسەندنی خێرای شار و شارستانبوون لەگەشەکردن دایە. ئەو خێزانانەی لەبەر هۆکاری جیاوازەوە لەتەواوی خێڵ و قەبیلەکان دابڕاون و لەگوندە قەڵەباڵغ و شارەکان سەربەخۆ و بەهێز دەبن، هێزی سەرەکی بەگەلبوونی کوردانن. لەکاتێکدا کوردان وەک گەل بەو شێوازە پەرەدەسەنن و بەرەو نەتەوەبوونێکی نوێی دیموکراتیک رێگا دەبڕن، بەڵام گوزەرکردنی چینی سەرووی قەبیلە لە میللەتێکی لاواز بۆ نەتەوە بەهەمان چڕی و خێرایی نییە. ئەو فەشەلەی ئەم چینە لەبوون بە بەنەتەوەی دەوڵەت دووچاری هات رێخۆشکەر بوو کە نەتەوەبوونی دیموکراتیک ببێتە چانسی کوردان. جیاوازی ریشەیی لەنێوان نەتەوەبوونی دیموکراتیک و نەتەوەبوونی دەوڵەتی هەیە. لە بەشەکانی داهاتوودا بە درێژی هەڵوەستە لەسەر ئەو بابەتە دەکەین.

کاتێک بەمجۆرە لەکولتووری خۆرهەڵاتی ناوین هەوڵی دەستنیشانکردنی لایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکانی تێکۆشانی کولتووری کورد و ئیسلامبوون لەپێناو ژیان دەدەین، پێویستە جەخت لەسەر کارەکتەری دینامیکی ئەو پرۆسەیە بکەینەوە. گەلبوون و قەومبون فۆرمێکی کۆمەڵایەتی پێگەیشتوو و بەقەبارەترن. پەرەسەندنی ئابووری دەوروبەری بازاڕ و نەشونمای کولتوورێکی نوێی گەل لەدەوری گەلبوون، گرووپی سۆفیگەرایی و میللیگەرای چینی سەروو وەک گەلانی دیکە بەشێوەیەکی گشتی کوردانیشیان بە دەروازەی نەتەوەبوون (ألتحول ألی أمة) گەیاندووە.

### کولتووری ئیسلام و پەیوەندییەکانی عەرەب ـ کورد ـ تورک

پەیوەندیەکانی کورد ـ عەرەب ـ تورک کە لەسەربنەمای کولتووری ئیسلامی چاخی ناوین شێوەی گرت رۆڵێکی گرنگ لەگەشەکردنی راستینەی کوردانـدا دەبینێت. بەتایبەتیش لەلایەکەوە پێکهاتەکانی دەسەڵات ـ دەوڵەتی بەشێوەی میرنشینەکان، لەلایەکی دیکەشەوە پێکهاتەکانی لەسەر بنەمای تەریقەتە سۆفیگەراییەکان لەقۆناخی نێوان سەدەکانی ٧ ـ ١١ لەژێر کاریگەری کولتووری عەرەب ـ ئیسلامی پەیوەندیەکانی عەرەب ـ کورد هاتنە ئاراوە، رێگای لەپێش کوردان کردەوە لەبواری گەلبوون و قەومبوون و میللەتبووندا (جیاوازییەکی زۆر

بچووک لەنێوان ئەو زاراوانەدا هەیە) پەرەسەندنی گرنگ بەخۆیانەوە ببینن. لەسەدەکانی پێشووتریشدا لەپەیوەندی فارس ـ کوردیشدا پەرەسەندن و گۆڕانکاری هاوشێوە جێگای باس بوو. پەیوەندییەکانی کورد ـ تورک کە لە بەردەوامی ئەو قۆناخە پەرەی سەند سەبارەت بە پاراستنی هەبوونی هەردوو گەل بۆ پەیوەندی ستراتیژی گرنگ وەرچەرخا.

ئەو تیرە و بەرەبابە تورکانەی بەهۆی ئەو دۆخە خراپەی لەهەلومەرجی کۆمەڵایەتی و کەشوهەوای ئاسیای ناوین هاتەئاراوە لەسەدەی دەیەم کۆچی خۆیان بەرەو خۆرهەڵاتی ناوین خێراکرد، بەدوای شوێنێکدا دەگەڕان کە بەردەوام تێیدا بژین. هەرچەندە لەمیانی فەتحکاریەوە شوێنگەلێکیان لەزەویەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ئێران بەدەستهێنا، بەڵام ئەوانە هەمیشەیی نەبوون. هەم لەپەیوەندی نێوان بەرەبابەکان خۆیاندا هەمیش لەگەڵ قەومە دراوسێکاندا بەردەوام لەنێوان ململانێکانی دەسەڵات دابوون. شەڕ و پێکدادانەکان دەرفەتێکی ئەوتۆیان بەنیشتەجێبوونێکی هەمیشەیی و ئارام نەدەدا. لەو سۆنگەیەوە؛ هەنگاونانیان بەرەو خۆرئاوا و کرانەوەیان بەرەو خاکەکانی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی و عەرەبی دەکرد بە ناچارییەک. ئەوجارە وەک قەوم رووبەڕووی عەرەب، کورد و ئەرمەنیەکان دەبوونەوە. گرنگترین سەربازە کۆکراوەکانی سوڵتانەکانی عەباسی ئەوانەبوون کە بەبنەچە تورک بوون. لەئاکامی ئەو رێبازەشەوە تەنیا بژاردەترین جەنگاوەرە تورکەکان نیشتەجێ دەکران. کەچی لەماوەیەکی زۆر کورتدا ئەوانە بوون بە عەرەب و دەیانتوانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کولتووری قەبیلەی خۆیان ببڕن. دابینکردنی خێرای شوێنی نیشتەجێبوون بۆ یەکینە بەرفراوانەکانی تیرە وەک کێشەیەکی سەرەکی رووبەڕوویان ببوویەوە. ئاتابەگ و خانەدانەکان لەسەر بنەمای توانا سەربازیەکانیان لە گۆڕەپانی عەرەبی، بەتایبەتیش لە ئێراقی رۆژی ئەمڕۆ تا دەگاتە میسر، چەندین میرنشینیان ئاواکردبوو. بەڵام بەرامبەر بەلێشاوە گەورەکانی کۆچیان ئەو میرنشینانە کورتیان دەهێنا و بەشی نەدەکردن. لێرەشدا دیاردەی کۆکردنەوەی سەربازی سەرەکی بوو، تیرە تورکەکانی دیکەش لەکۆچی بەردەوام دابوون و بەدوای شوێنێکی نیشتەجێبوونی هەمیشەییدا دەگەڕان. پەیوەندییە مێژووییەکانیان لەگەڵ کوردان لەمیانی ئەو گەڕانە هاتە ئاراوە.

کێشەی سەرەکی کوردان؛ هەم میرنشینەکان، هەمیش بەسیفەتی کۆمەڵی مەدەنی، لەو قۆناخەدا (سەدەکانی یازدە و دوازدە) سەرچاوەی خۆی لەو گیرخواردن و فشارانە دەگرت کە لەلایەکەوە بەهۆی شەڕ، گرژی و

ڕێککەوتنەکانیان لەمیانی پەیوەندییەکان لەگەڵ سوڵتانە عەرەب و داگیرکاریەکانیانەوە هاتبووە ئاراوە. لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی هەڵکەوتەکەیان کە دەکەوێتە سەر ڕێگای هێڵی داگیرکاری و پەلهاوێشتنی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی کە لە ڕۆماوە بۆی مابوویەوە. هەروەها پەلاماری قەبیلە بەبنەچە سەمیتک (سامی)یەکانیش کۆتایی نەبوو کە لە باشوور لەناوچە بیابانیەکان هاتبوون، لەیەمەنەوە دەهاتن و رابردووەکەیان بۆ سەردەمی کولتووری ئەلعوبێد (٥٠٠٠ -٤٠٠٠ پ.ز) درێژ دەبوویەوە. ئەو پەلهاوێشتنانەی لەسەردەمی ئەکەدی، بابلی و ئاشووریەکان بەپشتگیری ئیمپراتۆریەتەکانیان بەرەو باکوور (ئەو خاک و جوگرافیایەی ڕێگەی لەپێش دەستەواژەی بەهەشت کردەوە) بەردەوام بوو، لەسەدەی پێنجەمی پ.ز لەمیانی دەستپێکردنی داگیرکاری عەرەبی خێراتر بوو.

لەکاتێکدا عەرەبەکان لەمیانی ئیسلامیەتەوە لەڕێگای داگیرکاریەکانیانەوە هەرەس ئاسا گەورەدەبوون وەک لافاو تا ئەوروپا، قەفقاسیا و ناوەوەی ئاسیای ناوین ڕۆیشتن، گەورەترین زیانی بەجڤاتە نەریتییە ئاریانیەکانی باکوور گەیاند، لەسەرووی هەمووشیانەوە کوردە یەکەمینەکان و کوردان خۆیان بوون. دوای بەرخودانێکی بەرچاو کوردان بوون بە موسڵمان، چینی سەرووی کوردان ئاسیمیلاسیۆنی عەرەب - ئیسلامی پەسەندکرد، چینی خوارووش کۆمەڵگای مەدەنی سۆفیگەراییان پێکهێنا و هەروەک رابردوو لەلوتکە و قووڵایی شاخەکان گیرسانەوە و ستراتیژی پاراستنی بوونی خۆیان بەبنەماگرت. هەروەک ئاماژەمان پێکرد؛ لەمیانی ئەو ستراتیژیانەوە بەلایەنە باش و خراپەکانیەوە توانیان بەرگری لە بوونی خۆیان بکەن و پەرەی پێبدەن. لەکاتێکدا چینی سەرووی بەکرێگیراو میللیبوون (قەومیەت)ێکی سوننی (زیاتر خۆی سەر بە میللیبوونی (قەومیەت) عەرەب دەبینێت، کاتێک پێویستیش بێت کوردایەتی بەکاردێنێت) کردە بیانووی بوونی خۆی کە لایەنی نێگەتیڤی لەپێشە، چینەکانی خوارووش لەسەر بنەمای تەریقەتە سۆفیگەراییەکان (بەتایبەتیش مەدرەسەکان) کە لایەنی پۆزێتیڤی لەپێشە و کارەکتەری کۆمەڵی مەدەنییان هەیە بەئاراستەی گەلبوون پەرەیان سەند و لەچاخی ناوین کۆمەکێکی گرنگییان پێشکەش بە ڕاستینەی کورد کرد.

ئەو شالاو و پەلامارانەی لە باکوور و خۆرئاواوە دەهاتن، واتە ئەو هێرشانەی بە ئەسکەندەری مەکەدۆنیەوە دەستی پێکرد و بە ئیمپراتۆریەتی ڕۆما و بێزەنتیەکانەوە بەرەو ئیمپراتۆریەتەکانی ئێران، پارس، پارت و ساسانیەکان

بەردەوام بوو، زیاتر لە گۆڕەپانە سەرەکیەکانی ژیانی جڤاتە بەبنەچە کوردەکان روویاندەدا. لێشاوی ئەو شالاوە مێژووییەی لە باکوور، باشوور و خۆرئاواوە دەهات دوای ئەوەی بەیەکەوە لەگەڵ تیرە و میرنشینە تورکەکان و دواتریش ئیمپراتۆریەتەکانیان ئیمپراتۆریەتی ئێرانیان رووخاند، لەلای خۆرهەلات هێزیان بەدەستهێنا و بەخێرایی و قەبارەیەکی زیاتر بەردەوام بوون. بەمجۆرەش ئەو خاک و زەویانەی بە بەهەشت ناودەبران بوون بەخاکی نەفرەتی. پێویستە بەبایەخەوە ئاماژەی پێبکرێت کە مێژوویێکی پڕ لەشەڕی بێبەزەییانەی بەمجۆرە لەپشت دۆخی نەفرین و بێ چانسی کوردانەوەیە. ئەگەر بەشێوەی قەبیلە و خێڵ بین بەخاوەن هەبوون یان بەسیفەتی قەوم، بەردەوام کوردان ئاگاداری ئەو هێزە دەرەکیانەن کە ئەنجامی نەرێنی دەئافرێنن و لەناوەوەش پاشکۆیان هەبوو و بەردەوام جێگای باس بوون. لەناو ئەو هەلومەرجانەدا کوردان ئاشنای بەرەبابی قەبیلە، سوڵتان و میرنشینەکانی تورکان بوون. هەر دوو هێزیش بە ئەزموون و جەنگاوەر بوون. هەرچەندە لەیەکەم بەریەککەوتندا هەندێک شەڕ و پێکدادان لەنێوانیان روویدا، بەلام لایەنی دۆستایەتی و رێککەوتن لەپێش بوو. هەردوو لایەنیش پێویستیەکی زۆریان بەمە هەبوو. ئەگەر رێگای شەڕ و پێکدادانیان هەڵبژاردایە لەوانەبوو هەردوو لایەنیش بەشێوەیەکی ستراتیژی دۆڕابان و بەیەکەوە لەناو چووبانایە. وەک دەرکی پێدەکرێت ئەو تێگەیشتنە لەلای هەردووکیشیان جێگای باس بووە.

سوڵتان ئەلپ ئەرسەلانی خانەدانی ئۆغوزی سەلجۆقی ، کە نازناوی سوڵتانی لە خەلیفەی عەباسی وەرگرت، بۆ کردنەوەی دەرگاکانی ئەنادۆڵ لە کوردستان لە هاوپەیمانێک دەگەڕا. لەساڵی ١٠٧١ کاتێک خۆی بۆ شەڕی مەلازگرد ئامادە دەکرد پەیوەندی لەگەڵ میرنشین و خێڵە بەهێزەکانی کوردانی ئەو قۆناخە پێشخست. لەئاکامدا ئەو هاوپەیمانەی لە سوڵتانێتی مەروانی دۆزیەوە کە ناوەندەکەی مەیافارقین (سیلوان) بوو. هێندەی هێزەکانی قەبیلەی خۆی هێزی لەچەندین خێڵی دەڤەرەکە کۆکردەوە. بەپێچەوانەی مەزەندەکان شەڕی مەلازگردی بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی شەڕێک نەبوو تەنیا هێزی قەبیلە تورکەکان ئەنجامیان دابێت، بەڵکو شەڕێکە بەلانی کەم هێندەی ژمارەی ئەوان هێزی میرنشین و خێڵە کوردەکانیش بەشدارییان تێداکردووە و بەمجۆرە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. کاتێک لێکدانەوە و شیکارێکی راست بۆ شەڕی مەلازگرد بکرێت، ئەوا لۆژیکی ستراتیژی سەرەکی پەیوەندی نێوان کورد ـ تورکیش دەرکی پێدەکرێت. بەکورتی

دۆخەکە بەمجۆرەیە: بۆ پاراستنی بوونی خۆیان بەرامبەر بە پەلاماری رۆما و بێزەنتیەکانی خۆرئاوا و باکوور پێویستییان بەهاوپەیمانێکی بەهێز هەبوو. تورکەکان ئەو توانایەیان لەهێزەکانی عەرەب ـ ئیسلامدا بینی. ئەم پێویستیەی پاراستن و ئاسایش یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی ئیسلامبوونیان بوو لەسەر بنەمای ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ هێزە عەرەبەکان بەستیان تا ئەو کاتەی سولالە تورکەکان بۆ ناوچەکە هاتن. تیرە تورکەکانیش یان لەرێگای شەڕکردن دژ بە کوردان دەبوون بەهێزێکی داگیرکار، ئەگەر دەرفەتی ئەوەش نەبووایە، ئەوا رێککەوتنیان لەگەڵیاندا دەبەست و ئیمپراتۆریەتی بێزەنتییان بەرەو ئەولاتری خۆرئاوا دوور دەخستەوە و بەمجۆرەش شوێنی خۆیان دەکردەوە. هەردوو لایەنیش بەو لۆژیکە ستراتیژییەوە کەوتنە شەڕی مەلازگردەوە. مسۆگەر شەڕی هاوبەشی کوردان و تورکان بوو بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی.

ئەنجامەکانی ئەو شەڕە ئاشکرایە: دەرگاکانی ئەنادۆڵ بۆ تیرە و بەرەبابە تورکەکان کرایەوە، قۆناخێکی مێژوویی دەستی پێکرد. کوردانیش لەهێزێکی بەربەستی مێژوویی رزگاریان بووە کە بەدرێژایی سەدان ساڵ فشاری بۆدەهێنان و بۆ دواوەی دەبردن. لەو ئەرکەدا ئیسلام رۆڵی کەتیرەی بینیوە. ئەو شەڕە هاوبەشەی لەژێر پەردەی ئیسلامەوە ئەنجامدار، لەبنەڕەتدا بەئامانجی پاراستن و پەرەپێدانی بوونی هەردوو گەل بوو کە خەسڵەتە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانیان لە پێش بوو. دۆڕاندنیان هەر لەو سەردەمەوە مانای لەدەستدانی بوون و دواکەوتنی هەردوو گەل دەهات. مێژوویی فەرمی بەردەوام شەڕی مەلازگرد بەگەورەیی سوڵتانی تورک دەبەستێتەوە و ناوەڕۆکەکەی دەشارێتەوە. شەڕی مەلازگرد بەلانی کەم هێندەی تورکەکان شەڕی کوردانیشە. تۆمار نەکردنی لەدیرۆکی فەرمی راستیەکەی ناسرێتەوە، ناتوانێت بیسرێتەوە.

هەرچەندە ناوە بەناوە بەهۆی پێکدادانەکان تێکچوون بەخۆیەوە ببینێت، بەڵام ئەو لۆژیکەی پەیوەندی نێوان کورد ـ تورک تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. لەگەڵ نیشتەجێبوونی تورکەکان لەناوەوەی ئەنادۆڵ ئەو ستراتیژییە نوێیە هەر بەردەوام دەبێت. هەر دووگەلیش لەیادیان دەبێت کە لە ساتە هەستیارەکانی مێژوودا تەنیا کاتێک هەر دوو هێز بەیەکەوە رەفتار بکەن سەرکەوتوو دەبن. لە خانەدانێتی ئەیووبی کورد، چەندین میرنشینی ئەنادۆڵ و سەردەمی عوسمانیش بەردەوام ئەو لۆژیکە کارایە. کاتێک بۆ قووڵاییەکانی مێژوو شۆڕبینەوە دەبینین کە لەسەردەمی

پەیوەندی هیتیت ـ میتانی (١٦٠٠ پ. ز)بییەوە ستراتیژیەتێکی هاوشێوە لەنێوان هێزەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا لەئارادا بووە. هەم بەشێوەی گەل و هێزە سڤیلەکان، هەمیش وەک هێزەکانی دەسەلات ئەو تێکەڵبوونە جێگای باس دەبێت. نەک تەنیا بەرامبەر پەلامارەکانی خۆرئاوا بەڵکو بەرامبەر هەڕەشەکانی خۆرهەلات و باشووریش ئەو ستراتیژییە هاوبەشەی بەرگریی لەسەر کارە. سوڵتانی عوسمانی سەلیمی یەکەم یش لەمیانی چەمکێکی رێککەوتنی هاوشێوەوە پەلهاوێشتنی ئیمپڕاتۆریەتی خانەدانی سەفەوی ئێرانی بەربەست کردووە. لەهەمان مێژوودا (١٥١٤ـ١٥١٧) لەمیانی ئەو رێککەوتنەی بە پێشەنگایەتی ئیدریسی بەتلیسی ئەنجامدرا سەڵتەنەتی مەمالیکی تەوەرەی میسر کە لەباشوورەوە هاتبوون سەرەتا بەربەستکران، دواتر رووخێنران. لەشەڕی رزگاری سەرەتای ١٩٢٠کانیشدا هەمان ستراتیژی دەکەوێتە گەڕ.

لە شەڕی چاڵدێران ی ساڵی ١٥١٤ ی بەرامبەر پەلهاوێشتنی ئیمپڕاتۆریەتی خانەدانی سەفەوی ئەنجامدرا لە سەربازە کۆکراوەکان زیاتر هێزەکانی قەبیلە و خێڵە کوردییەکان جێگایان لە سوپاکەی یاوز سەلیمدا گرتبوو. هەم شوێنی روودانی شەڕەکە، هەم لەلایەنی سەربازیشەوە شەڕەکە لەئاکامی رێککەوتنی کورد ـ تورک سەرکەوتوو بووە! (پرۆتۆکۆلەکەی ئاماسیای نێوان یاوز سەلیم و بیست و هەشت بەگی کورد). ئەگەر حوکمڕانی مەمالیکەکان لە ماردین و ئورفا رەچاو بکەین ئەوا دەبینین کە شەڕی مەرج دابق (شوێنێکی نزیک شاری حەلەبی باکووری سوریایە) یش کارەکتەرێکی هاوشێوەی هەیە. ئەگەر بڵێین؛ هەردوو شەڕیش لەبواری ستراتیژیدا رۆڵێکی گرنگییان لە ڤەژین و سەربەخۆیی کورداندا بینی تا دوا رادە واقیعی و پێویستیشە. مێژوویی شۆڤینی بەردەوام راستیەکانی پەردەپۆش کردووە. ئەو شەڕانەی لەسەردەمی خانەدانەکانی سەلجۆقی، ئەیووبی و عوسمانی لەجوگرافیای کوردستان بەرپا بوونە پێویستە زیاتر بەشێوەی شەڕی کوردان لەبەرامبەر هێزە داگیرکارەکان هەڵسەنگێنرێت. شەڕی رزگاری نیشتیمانی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢ ش لەو چوارچێوەیە دایە. دەستکەوتی تورکەکان لەو شەڕانە لە ئەنادۆڵ وڵاتێکی هەمیشەییان بەدەست هێنا: بێگومان کورد نەبووایە نەیدەتوانی جێگای خۆی بکاتەوە.

ئەگەر بەشێوەیەکی راست دەرک بەماهیەتی پەیوەندی کوردان لەگەڵ قەوم، میرنشین، سوڵتان و قەبیلە تورکەکان نەکرێت، ئەوا مێژوویی پەیدابوونی هەردوو کۆمەڵگا بەراستی نانووسرێت. پێویستە زۆر بەباشی ئەو راستیە بزانرێت کە

کوردەکان لەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ تورکەکان ئەو ستراتیژیەیان پەسەند نەکردووە تا لەڕێگای ئاسیمیلاسیۆن یان توندوتیژی سەربازیەوە بوونیان بکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسیەوە، بەڵکو بەو ئامانجە بوو کە بەیەکەوە بوونی خۆیان بپارێزن و بەرەو پێشەوەی ببەن.

هەمان لۆژیکی ستراتیژی سەبارەت ئەو تورکانەش جێگای باسە کە خاوەن زهنیەتێکی قووڵی مێژوویین. نیاز و کردەوەکانی پیلانگێڕی "فاشیزمی تورکی سپی" ـ کە بەشێوەیەکی بابەتی مانای سیخوڕێتی بۆ خۆرئاوا دەبەخشێت ـ بەرامبەر هەردوو کولتوور بناخەی هەڵوێستی نکوڵیکردن لە لۆژیکی ئەو ستراتیژییە و ڕێکارە مێژووییەکەی سەدەی دوایی پێکدێنێت. سەپاندنی نکوڵی، قڕکردن، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆساید بەسەر ئەو کوردانەی لەیەکەم قۆناخەکانی ئاواکردندا پەیوەندیەکی خاوەن ئەمجۆرە ناوەڕۆکەیان بە بنەما گرتووە، گەورەترین خیانەتە بەرامبەر بەهەردوو کولتوور و بە زیان و دۆڕاندنی هەردووکیان ئەنجامگیر دەبێت.

ئایین ئەو دیاردەیە کە مۆرکی خۆی لە پەیوەندیەکانی نێوان کۆمەڵگاکانی چاخی ناوین داوە. لەچاخی ناویندا ئایین وەک میللیگەرایی رۆژی ئەمڕۆمان بەکاریگەر بووە. بەڵام لەراستی کۆمەڵگادا ئایین پەردەیەکی ئایدیۆلۆژییە و زمان و کولتووری نەریتی بوونی راستەقینە پێکدێنن. ئەو گۆڕانکاریانەی زمان و کولتووری کوردانیش لەژێر پەردەی ئیسلامی پیشانیداوە بەلایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکانیەوە بەردەوام بووە. دیاردەکانی گەلبوون و قەومبوون کە لەو چاخەدا زیاتر بەدەرکەوتن بووە بە یەکێک لەسەرەکیترین رەهەندەکانی راستی کولتووری. شانبەشانی زهنیەتی خێڵەکی و ئایینی زهنیەتی قەومیش پەرەی سەندووە.

# ئیسلامیەت و وڵاتپارێزی

با لە هەموو لایەنەکانی ئیسلامی راستەقینە تێبگەین، بەگوێرەی واقیعی وڵاتەکەمان لە کوردستان جێبەجێی بکەین و خاوەندارێتی لەو ئەرکانە بکەین کە فەرزی کردوون.

موسلمانانی وڵاتپارێز، بە تایبەتیش گروپێک لە گەنجانی کوردی موسلمان کە لە زانکۆی "ئەزهەر" دەخوێنن!

ئیسلامیەت یەکێکە لە گەورەترین ئەو شۆڕشانەی کە تا ئێستا لەمێژوودا ناسراوە. دەکرێ بگووترێت کە تا ئێستا هیچ شۆڕشێک هێندەی شۆڕشی ئیسلام کاریگەری لەسەر رێڕەوی مرۆڤایەتی نەبووە. هێندەی شۆڕشی ئیسلام لە هیچ ئایینێکی تردا ئەوەندە بەڕوونی و بەئاشکرایی و لەهەر لایەنێکی ژیاندا یەکسانی و دادپەروەری و ئازادی تێدا بەدی ناکرێ، هەروەها لەهەموو ئەو شۆڕشانەی تر زیاتر کە لەپێناو ئازادی و یەکسانی هاتوونەتە ئاراوە بەکاریگەرتر بووە. هەر لەبەر ئەوەشە ئیسلام بۆتە سەرچاوەیەک بۆ گەلێک لەو شۆڕشانەی کە لەدوای خۆی هاتوونەتە ئاراوە.

بەڵام بەداخەوە کە ئەمڕۆ لەژێر ناوی ئیسلامدا هەر جۆرە بیروبۆچوون و چەمکێکی کۆنەپەرستانە و دژە شۆڕش لە ئارادایە و لەدژی شۆڕشەکەمان بەکاردەهێنرێن.

لە بنەڕەتدا گەوهەری شۆڕشی ئیسلام یەکسانی، ئازادی و دادپەروەرییە، بەڵام بەداخەوە بەجۆرێکی ترو بە رەنگێکی زۆر خراپ بەکاردەهێنرێت: ستەم،

نکوڵی، تاریکی، کۆیلایەتی و نادادپەروەری پێ پەردەپۆش دەکەن، ئەمەش گەورەترین خراپەکارییە بەرامبەر بە ئیسلام ئەنجامدەدرێت و بەهیچ ڕەنگێک پەسەند ناکرێت و نابەخشرێت.

پێویستە ئەو ڕاستییە باش بزانین کە حەزرەتی محەمەد (د.خ) شۆڕشگێڕێکی گەورە بوو. ئەگەر وابەستەبوونێکی ڕاست و دروست بەو پێغەمبەرەوە هەبێت، پێویستە هەڵوێست وەرگرتن و ڕەفتارکردن بەرامبەر بە مرۆڤ، نەتەوە و وڵاتێک بە ڕەنگێکی یەکسان، ئازادو دادپەروەرانە بێ.

ئایا دەشێ حەزرەتی محەمەد بە پێغەمبەری خۆت دابنێیت و بەناوی ڕێبازەکەیەوە نکوڵی لە وڵاتێک بکرێت؟ کۆمەڵێک مرۆڤ بخرێنە ژێر زوڵم و زۆرداریەوە و هەر جۆرە گوشار و داگیرکارییەک بەسەریاندا بسەپێندرێت؟ بەناوی ئیسلام و فەرموودەی پێغەمبەریشەوە پشتگیری لەو دۆخە بکرێت؟ ئەمە گەورەترین خراپەکارییە، ئەو گوناحەش یەکێکە لە مەزنترین گوناحەکان.

پێویستە سەیری جەوهەر بکرێت نەک قسە، چونکە تەنیا قسە ناکەینە بناخە، کاتێک ئیسلام پەیدابوو هیچ شکل و شێوەیەک لەئارادا نەبوو، لەو سەردەمەدا بزووتنەوەیەکی هۆشیاری لە دژی چینی باڵادەستی جاهیل (بتپەرستەکان) لەئارادا بوو، خودایەکی دادپەروەر، دروستکردنی سیستەمەکەی لەسەر ڕووی زەوی، ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی لە جەهالەت و کۆیلایەتی وەکو ئامانجی سەرەکی دەبینێ. ئامانجی سەرەکی پێغەمبەریش هەر ئەوە بوو کە مرۆڤایەتی لەجەهالەت و کۆیلایەتی ڕزگار بکات، ئەمە ڕێگای ڕووناکی بوو، کەسیش ناتوانێت نکوڵی لێ بکات. لەو سەردەمەدا خودی پێغەمبەر ڕایگەیاندووە کە عەرەب لە عەجەم باڵاتر نییەو هیچ جیاوازییەک لەنێوان بەندە ڕەش پێست و سپی پێستەکاندا نییە. ئەگەر نکوڵی لەم ڕاستیانە ناکرێت؛ ئەی ئەمڕۆکە چۆن ئەوەندە جیاوازی دەخرێتە نێوان کورد و تورک، کورد ـ عەرەب و کورد ـ فارسەوە، تەنانەت ناوی کوردیش قەدەخە دەکرێت و نکوڵی لێ دەکرێت؟ ئەگەر موسلمانێتی ڕاستەقینە لەلایەن دەسەڵاتداران بە گشتی، بەرێوەبەرایەتی تورک، دەسەڵات و ئەوقافی تورکەوە چاودێری دەکرێت و بە شوێن پێییدا دەگەڕێن، ئەو کاتە ئەو نادادپەروەرییە چۆن ڕوون دەکەنەوە کە لەژێر ناوی ئیسلامەوە ئەنجام دەدرێت؟ ئەگەر فەرمانڕەوایان و بەڕێوەبەرانی تورک بەدوای ڕاستی موسڵمانێتیدا دەگەڕێن، ئەگەر بەگوێرەی ئەم فەرموودەی پێغەمبەر دەجووڵێنەوە، ئەوکاتە چۆن دەتوانن ئەم نایەکسانییە ڕوون بکەنەوە؟

چۆن ئەم نایەکسانییە لەلایەن موسڵمانان و زانایانی ئایینی و مەلاکانەوە پەسەند دەکرێت؟ ئەگەر ئەمانە دووڕوو و ریاکار و درۆزن نین و ئیسلام بۆ پارە کۆکردنەوە بەکارناهێنن، ئەی ئەمانە کێن؟

باوەڕی گەلەکەمان بە ئیسلامیەت، لەبەر دادپەروەری و نرخ و بایەخدانی ئیسلامە بە ئازادییەوە. پێویستە ئەو بابەتە بە باشی شیکاری بۆ بکرێت. ئیسلامیەت بۆ سەرجەم مرۆڤایەتییە. بۆ هەموو گەلانە، ریزی ئیسلامیەت تەنها ریزی عەرەب، فارس ـ عەجەم و تورک نییە. ریزی سەرجەم مرۆڤایەتییە. پێغەمبەریش، پێغەمبەری سەرجەم مرۆڤایەتییە و هیچ کەسێک ناتوانێت نکوڵی لێ بکات. ئەی لەبەرچی گەلێک هێندە گوشاری دەخرێتە سەرو رووبەڕووی بێدادی دەبێتەوە؟ ئەو کاتە پێویستە کوردە موسڵمانەکان، کەسایەتییە ئایینیەکان بە پوختی و بەشێوەیەکی گشتی دادپەروەری ئیسلام ببینن و بۆ جێبەجێ کردنی ئەو دادپەروەریەش راستی جیهادی ئیسلامی ببینن و مەجبورن پێویستیەکانی جێبەجێ بکەن. بە پێچەوانەی ئەمەوە موسلمانێتیەکەیان، موسلمانێتی ساختە و درۆ تێپەر ناکات. خاوەنداریێتی هەر گەلێک لە موسڵمانێتی، بۆ یەکسانی و ئازادی نەتەوەکەیەتی. ئەگەر وانەبێت ئەو نەتەوەیە موسڵمانی تێدا هەڵناکەوێت، ئەگەر لە بیرو هۆشدا نکوڵی لە بوون و مەزهەبی خۆی بکات، خەڵکێکی بەوجۆرە چۆن دەبنە موسڵمان. هەر وەک چۆن حەزرەتی محەمەد فەرموویەتی "ئەوەی نکوڵی لەقەومی خۆی بکات لەئێمە نییە".

بەڵام ئێستا یەکێک چەندە زیاتر نکوڵی لەخۆی بکات ئەوەندە مووچەی زیاتری پێدەدرێت. چەندە بە جەنگاوەرانی ئازادی و ماف و دادپەروەری بڵێ تیرۆریست و لەسەر ئەو بنەمایە ئایەتەکان بکات بە ئامرازێک و چەندەش بکەوێتە ناو مەزنترین گوناحەکانەوە، دەوڵەت ئەوەندە پارەی زیاتری دەداتێ، ئەم شتەش بێجگە لە دوژمنایەتی کردنی ئیسلام و مونافقکاری بەولاوە بەهیچ شتێکی تر لێک نادرێتەوە و هەڵناسەنگێندرێت.

تەواوی باوەڕمەندانی کوردستان و بە تایبەتیش موسلمانە رۆشنبیرەکان!

زۆر چاک ئاگادارن کە لەم ماوەیەی دواییدا لە هەر لایەکەوە ئیسلام گەشەسەندنێک بەخۆیەوە دەبینێ، سەرلەنوێ هۆشیاربوونێک لە ئارادایەو چەندین بزووتنەوە سەریانهەڵداوە، رێکخستن ساز دەبن و تەنانەت چالاکیش ئەنجام دەدرێن، وەک لەبۆسنا دەبینرێ لە ئەفغانستان و جەزائیریش پەیدابوون. تەواوی

ئەمانـە بـە نـاوی ئیسـلامەوە دەردەکـەون و بـەرێوە دەچـن. ئایـا تـا ئێسـتا هـیچ بزووتنەوەیەکی موسڵمانی کوردی راستەقینە لەئارادا هەیە؟ بۆ دەبێت لە شوێنێکی وەکو ئـەفریقیا بزوتنـەوەیـەکی ئیسـلامی دروست ببێت، بـەڵام لـە شـوێنێکی وەکو کوردستان بزوتنـەوەیـەکی ئیسـلامی کوردان دروست نابێت؟ بـەڕاستی پێویستە بزووتنەوەیەکی کورد ـ ئیسلامی چۆن و بە چ رەنگێک دەربکەوێت؟ ئەگـەر وایـە دەبـێ بەرنامـەو پرەنسـیپەکانی بـە چ رەنگێـک بـێ؟ ئایـا لەشـوێنی خۆیدایـە بزووتنەوەیەکی کورد ـ ئیسلام بێتە کایەوە؟ ئایا پێویستی بەمـە هـەیـە؟ ئایا هیچ کاتێـک ئەمـەتان بـە بیـر و خـەیاڵـدا هـاتووە؟ ئەگـەر بەبیرتانـدا نـەهاتووە کـەمو کوڕیـەکی گـەورەیـە. ئایا خراپترین نۆکـەری نییـە کە بـەناوی ئیسـلامەوە ئـەنجام دەدرێت؟

من لەم خاڵەدا وا بەچاکی دەزانم روونکردنەوەی واقیعی مێژوویی گرنگیەکی زۆر گـەورەی هـەبێ؛ ئیسـلام هێشـتا لەسـەرەتای پـەیـدابوونی دابـوو کـە لـەو سەردەمەدا هەندێک کەس مونافقکارییان دەکرد. ئەوکات ئەوانەیان بە (مرتجع) ناو دەبـرد کـە مانـای گـەڕانـەوە بـەرەو دواوە دەگـەیـەنێ. موسـڵمانە راسـتەقینەکان لەمەککە بوون کە بۆجاری یەکـەم ئایـەتی ئیسـلامیان بۆ هـات و لـەچوار دەوری خۆیان دەستیان کرد بە پڕوپاگەندە. لێرەدا سەرەتا کەوتنە بەر شاڵاوی ئەبوجەهل و بـت پەرسـتەکانی تـر، دەسـتیان کـرد بـە ئـازار و ئەشـکەنجە دانیـان. ئەوانـە شۆڕشگێڕ و ئیسـلامی راسـتەقینەو بـاوەڕمەنـد بـوون کـە بـە زمـانی ئـەمڕۆ پێیـان دەوترێـت "ملیتـان" و حـەزرەتی خەدیجـە و ئیمـامی عـەلی و حـەزرەتی هـەمزە لەسەرەوەی هەموویانەوە دەهاتن.

لـە سـەردەمی دەرکـەوتنی ئیسـلام موسـلمانانی ئـەو سـەردەمە بـە بـێ رەچاوکردنی هیچ بەرژەوەندییەک، بە تـەواوەتی لـە رێگـای بیـرو بـاوەڕیەکـەیـان جیهادێکی مەزنیان پێشخست و ژیانیان لەم پێناوە بەخت کرد و بەشێکی مـەزنیان شـەهید بـوون. ئەمانـەش ئـەو موسڵمانانە بـوون کـە کۆچیـان بـۆ مەدینـە کـرد و رووبـەڕووی هـەر جـۆرە زۆری و زەحمەتیـەک بوونـەوە. ئـەو کاتـەی کـە مەککـە سەرلەنوێ فەتح کرایەوە و رزگـار کـراو ئیسـلام تێیدا بـوو بـە دەوڵـەت، ئەوساکە کەسانێکی وەکو مەعاویە ئیسلامیان بـەڕەنگی سـەڵتەنـەتی ئیسـلامی پەسـەند کرد. ئەمەش بەئامانجی بەکارهێنان و سودمەند بوون بوو لـە نیعمەتـەکانی سـەرکەوتنی ئیسلامییەت، هەر بۆیەش تەقلی ریزەکانی ئیسـلام بـوون. واتـە کۆنـە مونافیقـەکان

دەستە دەستە نەک لە جەوهەر و کرداردا، بەڵکو بە قسە بوون بە موسڵمان. هەروەها ئەو راستیەش باش دەزانرێت کاتێک حەزرەتی محەمەد کۆچی دوایی کرد و هێشتا تەرمەکەی بەخاک نەسپێردرا بوو، هەمان ئەو کەسانە شەڕی دەسەڵاتیان دەستپێکرد. بەتایبەتی ئەو هەموو فیتنە و فەسادەیان بۆ ئەوە سازکرد کە خەلیفایەتی بدەنە دەستی هەندێکیتر نەک ئەوانەی مافی خۆیان بوو.

بەم جۆرە وەک باسمان کرد فیتنە و فەساد پەرەی پێدرا، واتە شەڕو ئاڵۆزی دەستی پێکرد، لێکدانی رەوتی راستڕەو و چەپڕەو، لایەنی شۆڕشگێڕ لەدژی هێڵی ناشۆڕشگێڕ دەستیان کرد بە تێکۆشان. هەر کەس باش دەزانێ کە حەزرەتی عەلی و لایەنگرانی و پیاوە چاکەکانی ئەهلی بەیت موسڵمانی راستەقینە بوون، موسڵمانی شۆڕشگێڕ و موجاهید بوون. ئەوانەی نزیکی کەسایەتی مەعاویەش بوون راستڕەو بوون. واتە نوێنەری بەرەی دژە شۆڕش بوو.

بەهەمان شێوە لەشۆڕشی فەرەنساشدا هەردوو رەوتی نیچیروان و پەراسێلکەکان هەبوون، کە ئەمانە هەندێکیان بە راستڕەو و هەندێکیشیان بەچەپڕەو ناودەبرێن. لەشۆڕشی رووسیاشدا بەهەمان شێوە. بەلشەفیک و مەنشەفیکەکان هەبوون. شۆڕشی موسڵمانانیش هەر بەمرەنگەیە. بەلشەفیکەکان بەرەنگی لایەنگرانی حەزرەتی عەلی دەرکەوتنە روو، مەنشەفیکەکانیش وەکو دەستەی مەعاویە بەدیار کەوتوون. ئەم ململانێیە تائێستاش لەرووسیا بەردەوامە. واتە لەزۆربەی شۆڕشەکاندا بەمجۆرە جیابوونەوەیەکی دوولایەنەو دوولەتبوونی تێدا دەبینرێ. وەکو باسمان کرد زۆرجار ئەم پارچەبوون و لەت لەت بوونە رێگای لەبەردەم سەدان ساڵ شەڕی خوێناوی کردۆتەوە. عەلەویتی، سوننە و شیعەتی و ....هتد پەیدابوون. ئەوانە چەندە گرێدراون بە جەوهەرو چۆنیەتی ناوەڕۆکەکەیان مەسەلەیەکی جیاوازە، گرنگ ئەوەیە تائێستاش ئەم کێشەیە چارەسەر نەکراوەو ئەو جیابوونەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. لەهەمانکاتدا زۆر چاک دەزانرێ کە موسڵمانێتی سەڵتەنەکاری پەیدابوو، واتە سەڵتەنەتی مەعاویە لەسەرەتای پەیدابوونی لەشام لە چوارچێوەی باڵادەستی عەرەبەکان لەمیانی تەڤگەرێکی گوشار و داگیرکاری پێشکەوت. بە پشتیوانی عەرەبەکان دەستیان کرد بە زوڵم و زۆرداری و داگیرکاریەکی بەرفراوان. گەلێک خوێنڕێژی وەک (حەجاج بن یوسف ئەلسەقەفی) لافاوی خوێنیان هەڵساند. بەڵێ خوێنڕێژی وەکو حەجاج لەئێراق و ئێران و کوردستان سێلاوێکی خوێنیان بەرپا کرد و لەژێر ئەوناوەی کە خەڵک دەکەنە موسڵمان بە زۆر و ستەم فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی

خۆیان دەسەپاند. واتە بەمەبەستی سەپاندنی رژێمی داگیرکەری ـ ئیمپریالیستی خۆیان ئەمەیان دەکرد. ئەوەی کە ئەمەویەکان کردیان داگیرکاریەکی ئیمپریالیانە بوو کە بەناوی ئیسلام و لەژێر دەمامکی ئیسلامیەت ئەنجامیاندا. ئەمە جاری یەکەمە بێ دوودڵی دەتوانین ئەو راستیانە دەرببڕین، کە لەو کاتەدا خەڵکی راپەڕین و یاخیبوونی گەورەیان لەبەرامبەردا نیشاندا، بەتایبەتی لەئێراندا ئەمە بەناوی شیعەوە خۆی نیشاندا، هەروەها عەلەوی: واتە لەژێر ناوی لایەنگرانی حەزرەتی عەلی بزووتنەوەیەکی یاخیبوونی بەرفراوانیان ساز کرد، عەرەبەکانیش بەهەمان شێوە دژی ئەو ئیمپریالیستییە راوەستان. کوڕە گەورەکەی حەزرەتی عەلی کە ناوی حەسەن بوو ژەهر خوارد کراو ئیمامی حوسێنیان لەکەربەلا شەهید کرد، بەڵام ئەو راپەڕینانە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر تەشەنەیان کرد.

زۆر باش دەزانرێت کە سەرهەڵدانە مەزنەکەی لە ئێران بە رێبەرایەتی "ئەبو موسلم خوراسانی" دەستی پێکرد سەڵتەنەت و داگیرکەری و ئیمپریالیستی دەوڵەتی ئەمەوییان تێکشکاند و هەڵیوەشاندەوە. لەشوێنی ئەوان عەباسییەکان هاتنە سەر حوکم، لە دوای ماوەیەکی کورت روون بۆوە کە لە بنەمادا لەزۆر لایەنەوە جیاوازیەکی ئەوتۆیان لەگەڵ ئەمەویەکاندا نەبوو و یەکسەر رێبەرانی سەرهەڵدێری وەکو ئەبو موسلم خوراسانیان کوشت و دەسەلاتی کۆلۆنیالیستی ـ ئیمپریالیستی خۆیان لە ناوەڕاستی ئاسیاوە تا دەگاتە ئەنادۆڵ و ئەفریقیا و ئیسپانیا تەشەنە پێداو خۆی بەرفراوان کرد. لەبەرامبەردا یاخیبوونی جیاواز لەژێر بەیداخی ئیسلام سەریانهەڵدا. لەئێران شیعە بەڕەنگی ئیسلامێکی یاخیبوو پەیدابوو، لەئەنادۆڵ عەلەوی وەک قۆڵێکی تری ئیسلامی یاخیبوو پەیدا بوون، لەم بابەتە گەلێک مەزهەب و بەرهەڵستکاری مەزهەبی هاتنە کایەوە.

داواکاری یەکسانی و دادپەروەری ئەم جوڵانەوانە لەچەمکی ئیسلامەوە هاتووە، واتە سەرهەڵدانی ئەم بزووتنەوانە لەژێر بەیداخی ئیسلامدا پێویستە لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی بۆ بکرێت.

فەرمانڕەوایانی عەباسی هەندێک لە کۆیلە تورکەکانیان خستە ناو ریزی سوپاکەیان. لەو سەردەمەدا تورکەکان تازە بەتازە لەئاسیای ناوەڕاستەوە لەرێگای ئێرانەوە دەهاتن و ژمارەیەک لەو تورکمانانەی کە هاتبوون خۆیان خستە ژێر فەرمانی عەباسیەکان، چوونە ریزی ئەرتەشەوە، لەناو ئەرتەشدا گەیشتنە پلەی فەرماندەیی، دوایی وردە وردە کاریگەری ئەمانە زیادی کرد. بۆ نموونە بەو

پشتیوانیەی کە لە عەباسیەکانیان وەرگرتبوو لەساڵی ١٠٠٠ی زایینی دەوڵەتێکیان لەژێر ناوی "سەلجوق" یەکان بۆ خۆیان دامەزراند و وردە وردە نوێنەرایەتی ئیسلام بەو هێزە نوێیەی تورک ئەنجامدرا. ئیتر وای لێهات ئەم تورکانە بوونە هێزێک کە نوێنەرایەتی ئیسلام بکەن. تورکەکان دەیانویست هەموو ئێران و ئێراق و ئەنادۆڵ بخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوەو بە تەواوەتی داگیری بکەن. بۆ ئەمەش بە خێرایی بوون بە ئیسلام. واتە لەسەر بنەمای بەرژەوەندیەکانیان ئیسلامیەتیان پەسەند کرد. موسڵمانێتی تورک موسڵمانێتی بەرژەوەندییە. واتە بۆ فەتح کردنی ئێراق، ئێران، ئەنادۆڵ و بەڵقان بوونە موسڵمان، ئیسلامیەتێک نییە کە لەسەر بنەمایەکی گونجاوی یەکسانی، دادپەروەری و ئازادی بێت. تورکەکان هیچ لەئیسلام تێنەگەیشتوون، تەنیا هەندێک ناوو ڕستەیان لەبەرکردووە و بۆ لەناوبردنی گەلان و سڕینەوەی ئاسەواریان بەکاریدەهێنن. تا ئێستاش چەمک و موسلمانێتی تورکەکان بە واتای موسلمانێتی داگیرکردن و تالان کردنە. موسلمانێتیەکە گوشار و داگیرکەری پێشدەخات. موسڵمانێتی خوێنڕشتنی هەموو گەلانە، تەنانەت موسڵمانێتی خوێنڕشتنی گەلی تورکمانیشە. موسلمانێتی سوڵتانە سەلجوقییەکان، دوای ئەوان سولتانە عوسمانییەکان و سەرجەم بەگ و میرە تورکەکان مانای ستەم، نایەکسانی، لەناوبردن و راگواستنی گەلانە. بەناوی موسڵمانێتیەوە موسڵمانێتیەکی ساختەیە، پێویستە ئەم راستیانە بەچاکی ببینرێت. لە راستیدا عوسمانییەکان پەیوەندییەکی ئەوتۆیان بە موسلمانێتییەوە نییە، لەبنەڕەتدا لەگەڵ ئیسلامدا شتێکی نامۆن بەیەکتر، بەڵام دەیانەوێت لەبەلقان خۆیان بەرفراوان بکەن، بۆئەوەی بەڵقان بخەنە ژێر دەستیان، دەبوایە ناوێک بەکار بێنن؟ بێگومان ئەویش ناوی ئیسلامە. لەژێر پەردەو ناوی ئیسلامێتی ئەستەمبوڵیشیان تالان کرد. بەکورتی هەر چەندە بەرژەوەندی، هەر چەندە تالان و داگیرکاری هەبێت، سەرجەمیان بە ناوی موسلمانێتیەوە ئەنجام دەدەن، لەسەر ئەو بنەمایە و لەکاتێکدا کە هیچ لێی تێناگەن، ئیسلامیەتیان زۆر بەکارهێناوە. بە کورتی ئەو خەڵکەی لەژێر دەمامکی ئیسلامدا بەچاکترین شێوە ئامانجی ئیمپریالیستی و داگیرکەرییان جێبەجێ کردبێ، قەومی تورکن. بەڵام عەرەبەکان ئیسلامیان وەکو بەشێک لە راستیەکەیان، وەکو ئایدیۆلۆژیایەک و سیاسەتیش ژیاندوویانە، بەڵام بەقەدەر سوڵتان و فەرمانڕەوایانی تورک لەسەر بناخەی بەرژەوەندی نزیک نەبوونەتەوە. هیچ فەرمانڕەوایەک نییە بەئەندازەی تورکەکان بە دووڕوویی و تەنانەت دژی گەلی خۆشیان ئیسلامیان بەکارهێنابێ، پێویستە ئەوە بە باشی

تێبگەین. بە بێ تێگەیشتن لەمە بە چەمکێکی راستی موسڵمانێتی ناگەین و بەسەدان ساڵ وەکو تووتییەک موسڵمانێتی لەبەرە و دەبێت بە موسڵمانێتیەک کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی ستەمکاران دەکات.

ئەو ئیمپریالیزمەی کە لە پشت ئیسلامیەتەوە خۆی پەنا داوە و بەرێوە دەچێت، واتە ئیمپریالیزم و داگیرکاری تورک نەبینین، ئەوا هەم زیان بە ئیسلام و هەم زیان بە گەلەکەمان دەگات.

ئەمرۆ گەلانی ئێران لەژێر ناوی شیعەگەریدا شۆڕشێکیان لەدژی ئیمپریالیزم ئەنجامداوە. شۆڕشێک بوو کە جیهانی هەژاند و بە شۆڕشی ئیسلامیی ناودەبرێت. لەسەر ئەو بناخەیەش کۆمارێکی ئیسلامییان دامەزراندووە. کاتێک سەرنج بدەین، ئایا لەکوردستاندا شۆڕشێکی ئیسلامی پەیدا بوو؟ وەکو باسمان کرد گەلێک شۆڕش بەناوی ئیسلامەوە بەرپا بوون. تورکەکانیش لەئەنادۆڵ ناوی ئیسلامیان بەکارهێناو بوون بە نەتەوە، وڵاتی خۆیان ساز کرد و سەرجەم ئەنادۆڵیان کردە موسڵمانی تورک، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە ئەنادۆڵ تەنانەت یەک تورکی تێدا نەبوو. هەروەها عەرەبەکانیش لەژێر ناوی ئیسلام لە سێ کیشوەردا بڵاو بوون و خۆیان بەرفراوان کرد. کە سەیری کورد دەکەین، ئیسلامیەت چی کردووە؟ یان بەناوی ئیسلامەوە کوردان بوون بەچی؟ تەنیا نکوڵیان لێکراوە و شکستیان خواردووە. لەکاتی دەرکەوتنی ئیسلام کورد لە پێش بوو، بەمەرجێ کاتێک ئیسلام تازە پەیداببوو لەبواری زمان و کولتووردا کوردان پێشکەوتوو بوون، لەعەرەبەکان و تورکەکان و تەنانەت لەفارسەکانیش پێشکەوتووتر بوون. تێپەربوونی ئیسلامیەت بۆ کوردستان بە دەستی ئەمەویەکان و دواتر بە دەستی عەباسیەکان زۆر خوێناوی بوو کە کولتووری کوردی و کۆمەڵگای کوردستانیان وێران کرد. ئینجا دوای ئەوەی ئیسلامیەت کەوتە دەست تورکەکان، بە تایبەتیش کە موسڵمانی ساختەیان وەک چینێکی بەکرێگیراو لە کوردستان دروست کرد، ئیتر لەرێگای چینێکی نۆکەرو بەکرێگیراو قۆناخێکی بێ ئامانی لەناوبردنی قەومی کوردان دەستی پێکرد. کە لێی ورد دەبینەوە، گەلی هەرە کۆنی جیهان لەبەر ئەوەی موسڵمانێتی لەجەوهەری خۆیدا جێبەجێ نەکردبوو! لەلایەن ئەمەویەکان، عەباسیەکان، تورکە سەلجوقی و عوسمانیەکان کە موسڵمانێتییان وەکو دەمامک بەکار دەهێنا، تەنیا وەکو گەلێکی داگیرکراو دەبینرێت کە پێویستە باج بدات و سەربازیان پێشکەش بکات. بێگومان رێژەیەکی زۆر لە کوردەکان کە بوون بە

موسڵمان ــ مەبەستم هەمووی نییە ــ بەڵکو زۆربەیان بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانیان خۆیان خستە ژێر فەرمانی عوسمانیەکان. بەم پێیە موسڵمانێتیەک لەدژی بەرژەوەندی کوردان پێشخراوە. بەمجۆرە دادپەروەری موسلمانێتی، برایەتی و یەکسانی موسلمانێتی لە یادکرا. تایبەتمەندی ئازادی موسلمانێتی لەبیر براوەتەوە. خەسڵەتە ئازادیخوازانەکەی ئیسلام لەبیر براوەتەوە، بۆ مووچەیەک سوڵتان هەر چ فەرمانێکی پێداون بەجێیان گەیاندووە. ئەمە ڕەنگێکی زۆر ترسناکی موسڵمانێتیە، بەداخەوە سەدان ساڵە ئەمجۆرە موسڵمانێتیە لەکوردستاندا باوو زاڵە. موسلمانێتیەکی کوردی وەکو موسلمانێتی ئێران دەرنەکەوت. شیعەی ئەمڕۆی ئێران بە راستی موسلمانێتی ئێرانە و بەسەدان ساڵە گەلی ئێران دەخاتە جوولە و سەرهەڵدانەوە، شیعەگەری سەدان ساڵە میللەتی ئێرانی لەسەر پێ ڕاگرتووە، گەورەترین شۆڕشیان سازکردووە.

باسەیرێکی خۆمان بکەین؛ بەناوی ئیسلامەوە هیچ بزووتنەوەیەکی سیاسیمان هەیە؟ ئایا بەناوی ئیسلامەوە بزووتنەویەکی کوردی، بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی، یان هێزێکی دامەزراندنی ستاتۆ بەدی دەکرێ؟ نەخێر نییە. کاتێک دەپرسین: بۆچی عەرەبەکان ئەوەندە دەوڵەتیان بەناوی ئیسلامەوە هەیە، بۆچی ئێرانیەکان بەناوی ئیسلامەوە دەوڵەتیان هەیە، بۆچی تورکەکان بەناوی ئیسلامەوە ئەوەندە دەوڵەتیان سازکرد، ئەی بۆچی کوردان بەناوی ئیسلامەوە شتێکیان بۆ خۆیان دروست نەکردووە؟ گوایە خوا فەرموویەتی نابێ، حەزرەتی محەمەد قەدەخەی کردووە؟ نەخێر پێغەمبەر فەرموویەتی کە عەرەب لەسەرەوەی عەجەم نییە. ئەوکاتە مافی کوردانیش هەیە کە چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن و ستاتۆی خۆیان دابمەزرێنن، موسڵمانێتی لەم بوارەدا هەڵوێستی روون و ئاشکرای هەیە. بەڵام ئەوانەی ئەمە نابینن یان کە دەیبینن و پێویستیەکانی بەجێ ناگەیەنن کێن؟ ئیمپریالیزم و داگیرکەران و موسڵمانی ساختە و بەکرێگیراوانی کوردن. سەدان ساڵە کە بەمجۆرە خەڵکیان بێهۆش کردووە و بەداخەوە گەلی ئێمەیان کردۆتە ئامێری دەستی موسڵمانێتیەکی ساختەو درۆزنانە. یان دەتوانین بە شۆڕشی چەواشەی لەناوبردنی ئیسلام ناوی ببەین، لەڕاستیدا دەبێ بەوانە نەگوترێت ئیسلام. پێویستە ئەوانە بە دەستەی ئیمپریالیست ـ داگیرکەران ناوببرێن کە لە ژێر پەردەی ئیسلامدا خۆیانیان حەشار داوە.

ئەمڕۆ کاتێک لەبەر رۆشنایی ئەو راستیانە سەیر دەکەین: ئەو کەسانەی لەپێناو مرۆڤبوون و نەتەوەبوون گیان لەسەر دەست دەجەنگن و ئامادەن

هەمووشتێکیان پێشکەش بکەن، زۆر جۆرە بوختانیان لەبارەوە هەڵدەبەسترێت و بەمەشەوە ناوەستن کە دەڵێن: ئەمانە نوێژ ناکەن و موسڵمان نین، لەئەنقەرەوە چەند کەسێک دەهێنن بەرامبەر بەمووچەو پارە ئایین و تەنانەت ئایەت و فەرموودەش چەواشە دەکەن و بەخراپترین شێوە بەکاری دەهێنن، بڵاوکراوە چاپ دەکەن و بە هەلیکۆپتەر بڵاوی دەکەنەوە. ئەمانە گەورەترین خراپەکاری بەرامبەر ئیسلام دەکەن، گوایە خۆشیان بەموسڵمان لەقەڵەم دەدەن. بێگومان دوژمنە، ئەو کارە دەکات. سەدان ساڵە پیشەیەتی و ئێستاش ئەنجامی دەدات. بەڵام ئەی ئێمە چی دەکەین؟ خەڵکە موسڵمانەکەی ئێمە چی دەکەن؟ رۆشنبیرانی موسڵمانی لەمەڕ خۆمان چی دەکەن؟ من لێرەوە لەهەموو کوردستانیان، لە سەرجەم گەلی موسلمان و رۆشنبیران دەپرسم؛ ئایا ئێوە راستی ئیسلام دەزانن؟ ئەگەر دەیزانن لەڕاستی وڵاتی خۆتاندا پەیڕەوتان کردووە؟ کوردستان لە چوارچێوەی تێڕوانینی ئیسلامیەتدا دەکرێ چۆن تاوتوێ بکرێت؟ مێژووی کوردستان، دۆخە سیاسیەکەی، لەگەڵ رەوشی کۆمەڵایەتی و ئابووری کوردستان لە روانگەی ئیسلامەوە چۆن دەکرێت هەڵسەنگاندن و شیکاری بۆ بکرێت؟ یان پرەنسیپەکانی ئیسلامیەت بەگوێرەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەرەوە چۆن جێبەجێ و پیادە دەکرێت؟ بە بێ رەچاو کردنی ئەمانە ئایا موسلمان بوون موومکینە؟ ئەو موسلمانێتیە ئەگەر موسلمانێتیەک نییە کە ناوەڕۆکی پووچ کراوە، ئەی چییە؟ ئەگەر ئەم راستیانە نەخرێنە بەرچاوان چۆن موسڵمانێتی لەکوردستاندا بونیاد دەنرێت؟ ئەگەر ئەم موسڵمانێتیە لەگەوهەری خۆی پووچ نەکراوە ئەی چییە؟ ئەمانە لەبەر ئەوە دەڵێم چونکە موسڵمانێتی لەوڵاتی ئێمەدا پەیڕەو ناکرێ، موسڵمانێتی بەیەکسانی پیادە ناکرێ، سەردەمێک موسلمان بووم و ئێستاش موسلمانم. بەڵام بینیم کە موسلمانێتی لە وڵاتەکەماندا جێبەجێ ناکرێت، موسلمانێتی بە یەکسانی جێبەجێ ناکرێت، لەبەرامبەر بەوە کاردانەوەم هەبوو، لەمە سڵەمیمەوە و لێی دوورکەوتمەوە و خۆم لە سۆسیالیزم ئاڵاند، دوای سۆسیالیزم کەوتم، ئەوکاتە کە بینیم سۆسیالیزمیشیان کردووە بە سۆسیالیزمی تورکی، ئەوەمان بە سۆسیال شۆڤێنیزم ناوزەد کرد، دەمانگوت یەکسانی، دادپەروەری و ئازادی لەسۆسیالیزمدا هەیە، پێیان گوتین کە سەرەتا ئێمە شۆڕش دەکەین (واتە تورکەکان) دوای ئەوە دان بەئێوەدا دەنێین. بەکورتی نکوڵیان لە بوونی نەتەوەییمان کرد، بۆیە هەڵوێستمان پیشانداو لەدژی راوەستاین. لەسەر

ئەو بناخەیە دژایەتی جێبەجێ کردنی ئیسلامیەتی ساختەشمان کرد، سۆسیالیزمی زانستیمان هێنایە کایەوە و لە کوردستان پەیڕەومان کرد.

ئەمڕۆ بەڕێبەرایەتی PKK شۆڕشێکی گەورەمان هەڵگیرساندووە، لەڕاستیدا مرۆڤ دەتوانێ بڵێ ئیسلامیەتیشمان لەکوردستان پەیڕەو کرد. من تەنها ئەوە ناڵێم کە سۆسیالیزممان لەکوردستان پەیڕەو کردووە، بەڵکو بۆ یەکەمجارە بنەماکانی ئیسلامی شۆڕشگێڕی لەکوردستاندا پیادە دەکەین. من بانگەشەی ئەوە دەکەم، کە ئیسلامێتی راستەقینە لەکوردستاندا ئەو ئیسلامیەتەیە کە PKK پیادەی کردووە. سەبارەت بەم بابەتە PKK چییە؟ ئەگەر بەچەند وشەیەکیش بێت ئاماژەیەکی بۆ دەکەین.

لەڕاستیدا PKK پەیڕەوکردنی تێکەڵەی ئیسلامی شۆڕشگێڕی و سۆسیالیزمی شۆڕشگێڕییە بەگوێرەی ڕاستینەی کوردستان. هەندێک لە چەپە ساختەکارەکان دەڵێن: سۆسیالیزم دژی ئیسلامیەتە، یان هەندێک موسڵمانی ساختەکار دەڵێن: ئیسلامیەت و سۆسیالیزم دژی یەکترن. بەڕای من دژی یەکتر نین. موسلمانێتی سەردەمی "سەعادەت" چی بێت، PKKی ئەمڕۆشمان هەمان شتە. PKK شێوەی پێکهێنان و جێبەجێکردنی سەردەمی سەعادەتی ئیسلامیەکانی عەرەبستانە لەڕاستی کوردستاندا: شکڵی دەرکەوتووی ئیسلامی سەردەمی سەعادەتی عەرەبستانە. هەر کەسێکی ئاگاداری مێژوو بێت، یان ئەوانەی مێشکی خۆیان دەخەنە کار ئەوە دەبینن کە موسڵمانێتی راستەقینە خۆی لە PKKدا دەبینێتەوە. چونکە نرخی هەرە مەزنی بە رزگاری مرۆڤەکان داوە و ئامانجی ئیسلامیش هەرئەوەیە، هەر بۆیەش بەم حاڵە بەختەوەر دەبێت و پیرۆزبایی لێدەکات. لە راستیدا هەندێک مەلای بە نرخ هەن، خۆیان هاتن و PKKـەیان دۆزیوە، بەڵێ خۆیان لەناو PKKدا بینیەوە. مەلا عەبدولڕەحمان یەکێک بوو لەو مەلا هێژاو بەنرخانەی کە دەمناسین. هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ گەریلایەکی PKK نەبوو. هێندەی ئەوان بە دسیپلین، ڕێک و پێک و بە سیستەم بوو. راستی ئیسلامیەت و جیهادی ئیسلامی لە گەریلاکانی PKKدا بینیبوو. زۆر بەوە خۆشحاڵ ببوو و لەم پێناوەشدا شەهید بوو. مەلایەکی تری بەهێز ناناسم کە هێندەی ئەو لەبەرامبەر بە کەمالیزم بەرخودانی کردبێت و رۆحی خۆی نەفرۆشتبێت!

ئەگەر باسی موسڵمانێتی بکرێ، پێویستە بەهاو نرخێکی زۆر بەرز بۆ ئیسلامێتی ئەو مەلا (٩٩) ساڵییە دابنرێ. هەروەها وەکو ئەو مامۆستایە گەلێک

مەلای دیکەش بینیان کە ئیسلامی راستەقینە لە کوردستان لەلایەن PKKـەوە جێبەجێ دەکرێت، هاتنە ریزەکانمان و بە دەیانیان شەهید بوون. دواترینیان مەلا سەید گونگورمان دێتەوە یاد کە خەڵکی شاری مووشی باکووری کوردستان بوو، لە یادمە کە دوژمن لەهەلیکۆپتەرەوە فڕێیدایە خوارەوەو پارچە پارچە بوو. هەروەها لەم دواییاندا لە گەڤەر، مەلازگرد و جەزیرە گەلێک مەلا و زانای ئایینی بەدەستی دوژمن شەهید کران، لە کەسایەتی ئەواندا دەیانویست بڵێن: "ئەگەر لە PKK نزیک ببنەوە پارچە پارچەتان دەکەین". بەڵام بەبڕوای من ئەوان موجاهیدی راستەقینەی ئیسلام بوون. بەمجۆرە راستیەکی مێژوویيان سەلماند کە ئیسلامی شۆڕشگێر لەکوردستاندا بە چۆن شێوەو شێوازێک جێبەجێ دەکرێت و خۆیان رادەست نەکرد. ٦٠ ـ ٧٠ ساڵ تەمەنیان بوو و تا دوایی بەرگریان لەکوردستان کرد.

بەمجۆرە لە ئیسلامیەت تێگەیشتن و دوژمنیش ئەوانی پارچە پارچە کرد، بوویەری شێخ سەعیدیش هەندێک بەو جۆرەیە. سەید رەزاش بەهەمان شێوەیە. موسلمانێتی ئەوان، موسلمانێتیەکە نەبۆتە ئامرازی داگیرکاری. لەبەر ئەو هۆکارەش یاخیبوون و سەرهەڵدانیان کرد. لەجیاتی تەسلیم بوون بە کەمالیزم (دەیانزانی لە دەرەوەی موسلمانێتییە و خیانەتە بە ئیسلام) سەرهەڵدانیان کرد و لەسێدارە دران. کە ئێستا سەرنج دەدەین، کێ درێژە بە رێگا و یادەوەرییان دەدات؟ کامە زانای ئایینی درێژەی پێدەدات و ئەو مەلایانە ئێستاکە تێکەڵاوی چ بزووتنەوەیەک بوون؟ بێگومان لەناو بزووتنەوەی PKKدا یەکیان گرتووە.

سەرەڕای سەرجەم هێرش و چەواشەکاریەکانی دەوڵەت، PKK و ئیسلامی شۆڕشگێر بەشێوەیەکی زۆر گونجاو ئاوێتەی یەکتربوون و بەگوێرەی راستینەی گەلی کوردستان پەیڕەو دەکرێ و هەر لەئێستاوە دەشێ سەرکەوتنی هێژاو بایەخدار لەم بوارەدا ببینین، ئەمەیە ئیسلامی راستەقینە. لەوانەیە کەسانێک هەبن خەڵەتێنرابن، بەڵام ئەگەر یەکێک بڵێت من موسڵمانێکی باوەڕمەندم، رێزو حورمەتم بۆ ئیسلام هەیە، وەلێ راستی کوردستان نەبینێ و لەپێناو ئەو راستییە دەست بە تێکۆشان نەکات: ئەوا بە دڵنیاییەوە ئەو کەسە موونافیق و دووڕووە.

هیچ نرخ و بەهایەک نادەیتە گەل و نەتەوەکەت، دادپەروەری، یەکسانی و ئازادییەکەی، بەشداری لە شەڕو جیهادەکەی ناکەی، بەڵام رۆژانە نوێژ دەکەی و بە رۆژوو دەبیت و دەڵێی: "من موسڵمانم". ئەوە موسڵمانێتی زارەکی و

رووکەشییە، موسلمانێتیەکی بێ ناوەڕۆک و پووچە. لە بنەڕەتدا موسڵمانێتی لەپیناو مرۆڤە، موسلمانێتی بۆ ئازادییە، موسلمانێتی بۆ شەڕەف و کەرامەتە. دوای بن پێکردن و پێشێلکردنی تەواوی ئەمانە، نوێژ و رۆژووەکەت هیچ نرخێکی نامێنێ. پێغەمبەرەکەمان فەرموویەتی لەکات و سەردەمی جیهاددا بنەمای سەرەکی جیهادە، نەک نوێژ و رۆژوو. بۆیە پێویستە سەرەتا جیهاد بکرێ، دواتر نوێژ بکەن و رۆژوو بگرن.

ئەلف بای ئەم ئیسلامە نازانن و پشتگوێی دەخەن، وەلێ لەو بڕوایەدان بەریشێکی درێژ و مێزەر بەستن و کەواو سەڵتە پۆشینەوە دەبنە موسڵمان! هەرگیز مەحاڵە، من باوەڕم بەمە نییە. سەرەتا مێزەرو کەشی نەبوون، کەواو سەڵتە نەبوو، وەک باسمان کرد تەنیا موسڵمانی شۆڕشگێر هەبوون. شەکڵ و شەمایڵ نەبوو، نە نوێژ نە ڕۆژوو هیچ یەکێکیان نەبوون. تەنها جیهاد هەبوو، شەڕی ئازادی هەبوو، دوای ئەمە کاتی نوێژ و ڕۆژوو دیاریکرا. بەڵێ شەکل و شەمایڵ دواتر پەیدابوو.

با ئێمەش شۆڕشی ئیسلامی خۆمان پەرە پێ بدەین، با ئێمەش چێژ لە ئازادییەکەی وەرگرین و پێویستیەکانی جێبەجێ بکەین، دواتر کاتی نوێژ و رۆژووش دێت، کاتی نیازیش دێت. من ناڵێم نوێژکردن شتێکی خراپە، بەڵێ نوێژیش دەکرێت و رۆژووش دەگیرێت، بەلام پێویستە بزانین کە جیهاد بەر لەهەموویانەوە دێت، منیش پێشتر نوێژم دەکرد، بەردەوام خەریکی دوعاکردن بووم، بەلام کە شەڕ دەستی پێکرد، چۆن کەوتمە نێو شەڕەوە، ووتم نوێژی هەرە مەزن جیهادە و لەو رۆژە بەدواوە شەڕێکی مەزن بەرێوە دەبەم، ئەمەش موسڵمانێتی راستەقینەیە. رێزێک کە بە ناوی ئیسلامیەتەوە پیشانی گەلێکی بدەی، بەمجۆرەیە. بزووتنەوەیەکی راستەقینەی ئیسلام بۆ ئێمەش پێویستە، ئەویش بە رێبەرایەتی PKK سەری هەڵداوەو پەرەسەندنی مەزن و هێژا تۆمار دەکات. لەوانەیە کەموکورتی هەبێت، یاخود باسی هەموو شتێکمان نەکردبێت، بەلام گرنگ ئەوەیە کە بنەما و پرەنسیپە بنەڕەتیەکانی ئیسلام پێک دەهێنین، لەمیانی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و لەسەر بنچینەی فەرموودەکانی پێغەمبەرو بە پاڵپشتی مێژووی ئیسلام دەتوانم ئەم راستیانە روون کەمەوەو بیانخەمە بەرچاوان، لەو بوارەدا هیچ زەحمەتیەک نابینم.

هێژایـــان ڕۆشـــنبیرانی ئیســـلام، بـــە تایبـــەتیش خوێنـــدکارە ئیســـلامیەکانی کوردستان!

وەک دەبینن ڕۆژی ئەوە هاتووە کە ئیدی ئیسلام بە شێوازێکی ڕاست فێر ببین و ڕاست لیی تێبگەین، بەگوێرەی ڕاستی و واقیعی وڵاتەکەمان و مێژووی ڕزگاری گەلەکەمان جێبەجێی بکەین. ئیتر کوردستان کەوتۆتە ناو شەڕێکی شۆڕشگێریەوە، دوژمنیش جارێکی دیکە دەیەوێت وەکو سەردەمی سەلجوقی و عوسـمانیەکان بــە شــێوەیــەکی درۆزن و ســاختەرانە ئیســلام بــەکار بهێنێــت، لەبەرامبەر ئەوەدا پێویستە ئێوەش دەرهەق بەگەوهەری ڕاستەقینەی موسلمانێتی و گەوهەرە شۆڕشگێریەکەی وەفادارو ڕاستگۆ بمێنن. دادپەروەرییە مەزنەکەی، یەکسانی و ئازادییەکەی بە بنەما وەربگرن و کوردستانی پێ بپارێزن و بەرگری لێ بکەن. عەرەبێکی موسڵمان چی بۆ عەرەبستان دەکات؟ شیعەیەک، فارس – عەجەمێکی موسڵمان چی بۆ ئێران دەکات؟ دیسان تورکێکی موسڵمان چی بۆ تورکیا دەکات؟ ئیدی کوردێکی موسلمانیش ناچارە شتێک بۆ کوردستان بکات. ئەگــەر ئــەنجامی نــەدەن، ئــەوا گــەلیش هــیچ نــرخ و بەهایــەکتان پــێ نــادات و کەسـایەتیتان نـامێنێ. لـەژێر نـاوی موسـلمانێتیەوە دەبنـە کەسـایەتیەکی نۆکـەرو بـەکرێگیراو. گـەلێک بـەناو موسـلمانی بـەمجۆرە دەرکـەوتن. بـەردەوام خزمـەتی درۆزن و تاڵانچیەکانیان کرد، بەتەواوی لەخزمەتی دوژمنان و داگیرکەراندابوون. موسلمانێتیەک کە خزمەتی گەل و وڵاتەکەی نەکات، ئەوە موسڵمانێتی ڕاست نییە، موسوڵمانێتی حەزرەتی محەمەد نییە. موسڵمانێتی سوڵتانەکانە. ئایا ئێمە لایەنگری موسلمانێتی حەزرەتی محەمەدین یاخود لایەنگری موسلمانێتی سوڵتانەکانین؟ ئەم پرسیارە وەڵامی ڕاستی پێویستە.

هێژایـــان ڕۆشـــنبیرانی موســـڵمان، هـــەروەها ســـەرجەم لاوو خوێنـــدکارە موسـڵمانەکانی زانسـتگەکانی تورکیـا و کوردسـتان کـە لەچەنـدین مەدرەسـەو قوتابخانەوە لەسەرووی هەمووشیانەوە لەزانکۆ و مزگەوتی مێژوویی ئەزهەرەوە هاتوون، لەو باوەڕەدام کە ئێوە گوڕو هێزێکی مەزن بەڕاستی ئیسلام دەبەخشن کە لەشێوەی یەکسانی و دادپەروەری و پرەنسیپەکانی ئازادی خۆی لە PKKدا دەبینێتەوە و بەردەوام باسی لێوە دەکات.

بۆ هەموو زانا ئایینی و مەلاکانی کوردستان، بەتایبەتیش ئەو زانا ئایینیانەی کە لە مەودوا دەکەونە خزمەت ڕاستینەی کۆمەڵانی خەڵک لەپێناوی ئازادی و

دادپەروەریدا. ئیدی راستیەکانی ئایین بۆ گەلەکەیان بە دروستی جێبەجێ دەکەن. چونکە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەریش بۆ گەلە، بۆ ئازادی و دادپەروەرییە. بۆیە ئەمە بە بنەما دەگرن. لە پێناو پارە، موسڵمانێتی و ئایین بە سوڵتانەکان و دەسەڵاتداران و دەوڵەتان نافرۆشن، ناپاکی دەرهەق بە ئیسلام پەسەند ناکەن و خیانەتی لێ ناکەن. بەمجۆرە دەزانن چۆن ببن بە موجاهیدێکی ئیسلامی. لەکاتی دەرکەوتنی موجاهیدانی موسلمانی لەم شێوازە، بۆئەوەی بناسرێن و بچنە کۆڕی خەباتەوە، ئەوا پاڵپشتی هەرە مەزن لە پارتەکەمان دەبینن. بەڵی پارتیمان باشترین چەشنی پشتیوانییان بۆ دابین دەکات. پارتیمان PKK پارتی ئەمانەیە، ERNK (بەرەی رزگاری نەتەوەی کوردستان) بەرەی ئەمانەیە و هەروەها ARGK (ئارتەشی رزگاری گەلی کوردستان)یش لەشکری خۆیانە. لەو بڕوایەدام کە موسلمانانی گەنجیش ئەو ڕێگایە دەگرنە بەر کە بەخوێنی پاکی ئەو مەلا شەهیدانە کراوەتەوە، بە رەنج و هەوڵدانێکی مەزنەوە ئەو ئەرکانە بە سەرکەوتوویی جێبەجی دەکەن کە دەکەوێتە سەر شانیان.

توێژینەوەو لێکۆڵینەوە لەسەر مێژووی ئیسلام و دەربارەی هەر زانستێکی ئیسلامی دەکەن، لەهەر روویەکەوە قوتابخانەکان و زانستگە و مزگەوتی ئەزهەر دەرفەتێکی فراوانتان پێشکەش دەکات. ئەوەی کە من دەمەوێت و لەم روونکردنەوانەدا تەقەلای بۆ دەدەم لەو چوارچێوەیەدایە کە ئێوە بتوانن جارێکی دیکە چاوێک بەزانستی ئیسلامیدا بخشێننەوە و ئاگاداری ئەو ئەرکانە بن کە بۆ پەیڕەوکردنی ئیسلام لە کوردستان لە ئەستۆتاندایە. بەڕاستی سەرەتای ئەرکێکی مێژوویی یەکجار گرنگتان لەپێشدایە، بەرئەندامن بۆ جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکە مێژووییە. بۆ ئەم مەبەستەش تاقم و دەستە و گروپ لەنێو خۆتاندا پێک بهێنن. بە تایبەتیش لە شوێنێکی وەکو میسر دەکرێت کۆمیتەیەکی کوردستانی ئاوا بکەن، دەکرێت بناخەی تەڤگەرێکی ئیسلامی کوردستانی رەنگرێژ بکەن. لەو چوارچێوەیەدا دەکرێت کە پەیوەندییەکان بەرفراوان و توندو تۆڵتر بکەن. دەکرێت پەیوەندیەکانتان لەگەڵ مەلا بە نرخەکانی بزاڤی ئیسلامی کوردستان بەرفراوانتر بکەن کە پەیوەندیتان لەگەڵ دەبەستن. هاوکات ئێوە هەندێکتان لە وڵاتەوە هاتوون، دەتوانن پەیوەندیەکانتان لەگەڵ خانەوادەکانتان و ئەو موسلمانە راستەقینانە بەرفروانتر بکەن کە دەیانناسن، پێتان دەکرێ پەیوەندی رێکخراوەیی بەپێی راستی ئیسلام لەگەڵیاندا پەیدا بکەن و رێکخستنی خۆتان پێش بخەن. ئەمانە تێکڕا هەموویان ئەرکن. بەتایبەتی لە چوارچێوەی ئاییندا ئێوە دەتوانن راستییەکان

روونتـر شـیبکەنەوە. چـۆن دەکرێـت لـە چوارچێـوەی ئیسـلام و ئاییـندا خزمـەتی کوردستان بکرێت، چۆن دەکرێت خزمەتی شـەڕی ئازادییەکـەی بکرێت؟ پێویسـت ناکات ئەمە بۆ کەسانی تر بهێڵنەوەو بخرێتە ئەستۆی هەندێکی دیکە. بە لانی کـەم پێویسـتە ئێمـەش وەکـو تـورک، عـەرەب و فـارس – عەجەمـەکان لێکۆلینـەوەو شیکردنەوە سـەبارەت ئیسـلامی خۆمـان بکـەین و بـزانین جێبەجێی بکـەین. ئەمـە جگـە لـەوەی مـافی خۆمانـە، لەهەمانکاتـدا ئەرکێکـە فـەرامۆش ناکرێـت. ئیـدی لـە چوارچێوەی مێژووییدا کوردستان بەقۆناخێکی گرنگدا تێپەڕ دەبێت. ئەگـەر لەسـەر ئـەو بنەمایـە نزیکی ئەرکـەکانتان نەبنـەوەو جێبـەجێیان نەکـەن، ئـەوا رووتـان نـابێ لەنێو خەڵکا سـەرتان هەڵبڕن.

ئێتر کوردستان یش کەوتۆتە ناو ئەو قۆناخە مێژووییەوە. خەڵکی کوردسـتان کەوتۆتـە نێـو بۆتـەی تێکۆشـان و شـەڕێکی گـەورەی بـەدیهێنانی ئـازادی، مـاف و دادپەروەریەوە. ئەگەر ئێوەش گەورەیی ئەو شـەڕو تێکۆشـانە لەبـەرچاو نـەگرن و رۆڵی خۆتان نەبینن و ئەرکەکانتان جێبەجێ نەکەن، نـاتوانن قاچتـان لەسـەر خـاکی ئەو وڵاتە دابنێن، ئەگـەر بتـوانن ئەمـەش بکـەن، هـیچ کەسـێک سـڵاوتان لـێ ناکـات، ئەمەش لە کاتێکدایە کە پێویستە ئێوە پێشـەنگایەتی ئـەو کـارە بکـەن. بـە درێژایـی مێـژوو موجاهیـدەکان پێشـەنگایەتی سـەرهەڵدانـەکانیـان کـردووە. شـێخ سـەعید موجاهیدێکە. سەید رەزاش بە هەمان شێوە موجاهیدێکە. هەموویان تەمـەنیان ٧٠-٨٠ سـاڵان بـوو. بـەڵام ئێـوە لاون، بـۆچی جیهـاد و موجاهیدی ناکـەن؟ ئـەوەی کـە لەسـەر شـانی ئێوەیـە پێشـڕەوی کردنـە لـەم کـارەدا. ئێـوەش ئاگـادارن کـە لـەناو PKKـەشدا گەلێک مەلای هێژا هەیە. ئەوانیش جیهاد دەکەن. ئەمەو ئەو کاتە رۆژی جیهادە. ئیسلامیش ئیسلامی نێو جیهادە، ئیسلامێکی جیهادکارانـەیە. ئیسـلامێک کـە رێگـری لـە جیهـاد بکـات، بـە بـاوەڕی ئێمـە ئیسـلامێکی راسـت نییـە. ئیسـلامیەتی پێویسـت بـۆ کوردسـتان ئـەو ئیسـلامەیە کـە بڕیـاری جیهـاد دەدات. ئیسـلامیەتێکە بەگوێرەی ئەمە خـۆی رێکخسـتە دەکـات و بـە هـەموو هێـزو توانایەکیـەوە بڕیـاری چالاکی دەدات.

لەو بڕوایەدام کە لەسەر ئەو بنەمایەو لەژێر رۆشـنایی پەرەسـەندنە مێژوویـی و رۆژانەییەکان هێزی توێژینەوە و لێکوڵینەوە بەدەست دێنن. ئەگەر پێویستیەکتان هەبێت، ئەوا بە هاوکاری دۆسـتانی پارتیمـان و بـە پاڵپشـتی ئێمـە دەتـوانن دابینیـان بکەن. ئێمە لەوبارەوە بۆ هەر هەرجۆرە هاوکـاری و پشـتگیریەک ئامـادەین. بـەڵام

پێویستە ئێوەش لەمەودوا بزانن هێزو تواناکاتان بۆ خەبات و تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی گەلی کوردستان بکەنە یەک. بەتایبەتیش پێویستە تێکەڵی، پەیوەندی و پەیوەستبوونی خۆتان پەرە پێبدەن. بە هەرحاڵێ دەبێت خاوەنداریێتی لە ئەرکەکانتان بکەن کە تائێستا دواخراوە.

ئێوە ئەی موسڵمانانی راستەقینەی کوردستان و رۆشنبیرانی ئایینی و خوێندکاران؛ من تەنیا لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانم رێزی خۆم نیشان بدەم، واتە بە سازکردنی شۆڕشی کوردستان دەتوانم رێزو حورمەتی خۆم رابگەیەنم. بەراستی منیش هەر لەمنداڵیمەوە رێزێکی زۆرم بۆ ئیسلام داناوەو یەکێکم لەو کەسانەی کە ژیانم بەپێی ئەو راستیانە پێوانە دەکەم. کاتێک سۆسیالیزممان بەبنەما وەرگرت و لەگەڵ راستی ئیسلامی خۆرهەلاتی ناوین یەکانگیرمان کرد، بڕوامان کرد کە کاری هەرە راستمان کردووە. ئیدی لەمەودوا گەلانی موسلمانی خۆرهەلاتی ناوین بۆیان نابێ سۆسیالیزم و ئیسلام لەدژی یەکتر بەکاربهێنن، بەڵکو پێویستە هەر یەکەیان بە شێوەیەکی راست ئەوەی دیکەیان شرۆڤە بکات و ناوەڕۆکە شۆڕشگێرانەکەیان ئاوێتەی یەکتر بکرێت، ئەمەش ئاراستەی راستەقینەی رزگاری گەلانی خۆرهەلاتی ناوین دەستنیشان دەکات. ئەمڕۆ بنچینەی ئەمە دروست بووەو PKKش نوێنەرایەتی ئەم رێبازە دەکات. هەم لەڕووی مێژوویەوە هەرچی لایەنێکی پێشکەوتنخوازی، دادپەروەری، یەکسانیخوازی و ئازادیخوازی راستینەی ئیسلام هەبێت بەبنەمای وەردەگرێت، هەم لایەنەکانی دژە زۆرداری و چەوسانەوەی بەبنەما وەردەگرێت. هەروەها لەهەمان کاتدا لایەنی یەکسانیخوازی و ئازادیخوازیەکەی سۆسیالیزمی هاوچەرخیش بەبناخە وەردەگرێت. کاتێک ئەوانە ئاوێتەو یەکانگیر دەبن گەورەترین هێز دێتە ئاراوە. PKK لەو بوارەدا بە بانگەشەیەو هێزێکە هەنگاوی سەرکەوتوانەی ناوە، بزووتنەوەیەکە لەلایەن دۆست و دوژمنانیشەوە ناسراوە. پێموایە ئێوەش ئێستا باشتر دەیناسن و بەباشترین شێوە ئەم راستیانە دەبینن و نیازی خۆتان دیاری کردووە کە بەشداری ئەم خەباتە بکەن. بۆ ئەمەش دەبێ خۆتان بەهێز بکەن. بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی موسلمانێتی راستەقینە ئەو دەرفەتە وەکو چانسێکی مەزن هەڵسەنگێنن و بە دڵنیاییەوە باوەڕم کە لە تێکۆشانی خۆتاندا دەیسەلمێنن.

ئێمە لە کوردستان لەناوجەرگەی تێکۆشان و شەڕێکی مەزنداین. ئەمەش لەهەر مەیدانێکدا بەردەوام پەرەسەندنی بەرچاو لەگەڵ خۆیدا دێنێتە ئاراوە و بەشێوەیەکی رۆژانە پەرە بەسەرکەوتنەکان دەدات. لەو شەڕو تێکۆشانەدا

دەتوانین سەرکەوتن بەدەست بێنین. دەتوانین بڵێین لە مێژوودا بۆ یەکەم جار یەکپارچەیی و یەکێتی سەرتاسەری کوردستانمان لەسایەی رێبەرایەتی PKKدا پێشخست. هەروەها دەکرێت بڵێین کە سەرجەم مەزهەبەکانی موسڵمانێتی "عەلەوی، سوننە: شافیعی و حەمبەلی" مان لە دەوری یەکتر کۆ کردەوە. تەنانەت دۆستایەتی توێژە جیاوازەکانی ئایینەکانی دیکەشمان بەدەست هێنا. لەهەر توێژو هۆز و خێڵێک مرۆڤی جیاجیامان هێنایە لای یەکتری و کۆمان کردنەوە. ئەمڕۆ ئێمە هەنگاو بە هەنگاو لە مێژوومانـدا شەڕی ئازادی هەرە درێژخایەن و سەرکەوتوو بەرەو کەناری سەرکەوتن دەبەین. ئەمە خەونێک بوو و رۆژ بە رۆژ بەدیدێت و دەبێتە حەقیقەت. ئەمە لەبنەڕەتدا ئەرکێک بوو کە پێویست بوو ئێوەی رۆشنبیرانی ئیسلامی و موجاهیدان جێبەجێتان بکردایە. بەڵام ئەو ئەرکەی لەبەر هۆکاری جۆراوجۆرەوە ئێوە جێبەجێتان نەکرد، ئێستا ئێمە جێبەجێی دەکەین. هەر بۆیەش نرخێکی باڵا بەم کارە بدەن و هەر چەندە درەنگیش بووبێت بیر لەئەرکی خۆتان بکەنەوە و خاوەندارێتی لێ بکەن.

مێژوو هەمیشە ئەرکی شەڕەفمەندانەی بەمجۆرە بە مرۆڤەکان ناسپێرێ. کاتێ سەردەمی "سەعادەت" بەدیهات، ئەو کاتە جیهادکاران چەندە بەختەوەر بوون و خۆزگە بە حاڵیان! بەڵێ سەردەمی سەعادەتی کوردستان یش بەو رەنگە دەبێت. خۆزگە بە حاڵی بەشدارانی ئەو قۆناخەو چەندە بەختەوەرن!

لەو چوارچێوەیەدا لەو بڕوایەدایـن کە خزمەتی هەرە مەزنمان پێشکەشی ئێوەی رۆشنبیران کردووە. هەموو ئایینەکان و ئیسلامی راستەقینە هەوڵ بۆ بەدیهێنانی سەردەمی سەعادەت دەدەن. دڵنیام کە بەدیهێنانی خەونی موسلمانە راستەقینەکان دەبێتە مژدە و لەبارترین زەمینەی دڵخۆشی سازدەکات. بەڵام پێویستە بزانین کە زیاترینی ئەم کارە لەمەودوا بەیەکەوە ئەنجامی دەدەین، کاتێک هیواو ئاواتەکانیشمان رۆژ لەدوای رۆژ بەدی بێت، ئەوا بەیەکەوە لەو سەردەمە مەزنەی سەعادەتەدا دەژین.

لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر بە کورتیش بێت هەندێک باسی راستیەکانم کرد و پێداگریمان لەسەر کرد، لەو بڕوایەدام کە بەشێک لە ئەرکی خۆم جێبەجێ کردووە. من نامەوێ تەنانەت یەک تاکی خەڵکی کوردستان بەدەست بەتاڵی بهێڵمەوە، بگرە نامەوێ یەک کەس بێ پەیوەندی بهێڵمەوە، ئەمە فەرمانی موسڵمانێتیە. منیش جارێکی تر پێویستیەکانی ئەم فەرمانە بەئێوە رادەگەیەنمەوە. ئەوەی کەوتۆتە

سەرشانی من ئەنجامماوەو لەمە بەدواوەش بەردەوامی پێدەدەم. چاوەڕوانی ئەوەم کە ئێوەش لەمەوبەدوا پێویستیەکانی ئەرکەکانی سەر شانتان لەچوارچێوەی فەرمانەکانی ئیسلام جێبەجێ بکەن. ئەگەر ناتەواوی و کەمو کورتی لەئێمەدا هەبووبێت نایان هێڵین و تێپەڕیان دەکەین. بۆ ئەوەی ئێوەش نەیان هێڵن و تێپەڕیان بکەن، هەر هاوکاری و پاڵپشتیەکی لەدەستمان بێت دریغی ناکەین. لەسەر ئەو بنەمایە هیوادارم ژیانی داهاتووتان هاوشێوەی موسلمانێتی سەردەمی سەعادەت نورانی بێت، دیسان وەکو موجاهیدانی ئیسلامی ئەو سەردەمە شەڕو تێکۆشان لەپێناو گەل و وڵاتی خۆتان بکەن و ئومێدەوارم سەرکەوتنی مەزن بە دەست بێنن. بۆ ئەمەش هەموو شتێکی خۆتان بخەنە مەیدانەوە و مسۆگەر چاوەڕوانی سەرکەوتنتانم.

سڵاو و ڕێز و حورمەتی خۆمتان پێشکەش دەکەم.

سەرۆکایەتی PKK

٢٣ی یەکی ١٩٩٤

# وڵاتپارێزی نەبێت، ئایینیش نابێت

لەو بڕوایەدام کە مەلا وڵاتپارێزەکان لە کوردستان و لە مێژوودا، ئەو ئیمامانەن کە لەگەڵ گەل و مێژوودان.

تا ئێستا دەتانەویست لە شوێنی خۆتاندا کار بکەن. بەڵام خزمەتی ئەو سەرۆکە کلاسیکانەتان کرد، بە تایبەتی خزمەتی PDKتان کرد. بەڵام بە شێوەیەکی بێ ئاگایانە خزمەتی ئەوانتان کرد. ئەوانیش بازرگانییان بە مەسەلەکەوە دەکرد. ئێستاش هەمان شت دەکەن. ئێوە زۆر باش دەیانناسن. ئەوانە کێن و خزمەتەکانیان بۆ کێیە، بە باشی دەیانبینن و هەموو شتێکیان لەبەرچاوانە. هەرچی ئێوەن دەتانەوێت خزمەتی گەلی کورد بکەن. ئەوەی ئەو رژێمە ستەمکارە بەسەر گەلی کوردیدا هێناوە، نە ئایین و نە ئیمان هیچیان پەسەندی ناکەن. ئێوە دەتانەوێت یەکێتی ئەو گەلە دامەزرێنن. ئەوە هەوڵدانێکی راستە. زۆرباش ئاگادارم کە ئایین و ئیمان چییە. هەروەها دەزانم کە نوێژ و رۆژوو چین. بەر لەهەر شتێک من شەڕەف و کەرامەتی مرۆڤایەتیم لە ئیسلامیەت و ئاییندا بینی. بەڵام شتێکی تریشم بینی؛ گەل ئازاد و نیشتمان سەربەخۆ نەبێت، ئایین و ئیمانیش پەسەند ناکرێت.

ئایین و ئیمان بۆ سەربەخۆیی و ئازادی بوونیان هەیە.

ئەوەی باش لە موسلمانێتی تێدەگات، هەروەها دەیناسێت و لێی ئاگادارە، ئەگەر بۆ سەربەخۆیی و ئازادی کارو خەبات نەکات، هەڵەیە. ئەوەی کە دەڵێت من کەسێکی ئایینیم، باوەڕمەندو ئیماندارم؛ تەنیا نوێژ دەکەم و رۆژوو دەگرم: بۆیە ڕاست و دڵسۆزم، ئەمە شتێکی هەڵەیە. بەر لە هەموویان پێویستە کار و خەبات

بۆ نیشتمان و وڵات بکرێت، بۆ سەربەخۆیی و شەرەفی مرۆڤایەتی کار بکرێت. یەکەم دەرکەوتنی ئیسلامیش بەم شێوەیەیە. بەڵێ مەزن بوونی موسلمانێتیش لەوەدایە. شۆڕشی ئیسلام بۆ بڵندکردنی شەرەفی مرۆڤایەتی بوو. بۆ سەربەخۆیی و ئازادی مرۆڤایەتی بوو. لە دژی کۆیلایەتی و نادادپەروەری و زوڵم و ستەم بوو. ئەو راستیانە زۆربەیان لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکاندا باس کراون.

ئێستا نوێژ دەکەن و رۆژوو دەگرن، بەڵام دوورن لە نیشتمان و ئازادی! نیشتمان لە ژێر داگیرکاریدا بێت، ئەگەر نەتوانیت بەرگری لێ بکەیت و چارەنووسی وڵاتی خۆت دیار بکەی، نوێژ و رۆژووش حەرامە. بۆیە داوای شەڕ و جیهادی لێ دەکرێت، جەوهەری ئیسلامیەتیش بەمجۆرەیە. ئێوە باش دەناسم. ووتارم بۆ زانا ئایینی و مەلا شەرەفمەند و مێژووییەکان پێشکەش کردووە. لەگەڵ مەلا عەبدولڕەحمان کە وەکو گەنجێک بە جۆش و خرۆش بوو، دیدارم کردووە و رێزی لێ دەگرم. مەلای راستەقینەیە! ٩٨ ساڵانە، بەڵام هاوشێوەی گەنجێک تێکۆشان دەکات. بە دەستەکانی خۆی کار دەکات و دەچێتە سەر چیاکانیشەوە. تێپەری ٩٩ ساڵانی خۆی دەبێت. بەڵێ مێژووی کوردستانە. مەلای راستەقینەی کوردستان بەمجۆرەیە.

لەمیانەی وتەکانیدا (مەلا عەبدولڕەحمان) باسی لە خیانەت و ساختەکاریەکانی PDK کرد، ٤٠ ساڵ خزمەتی ئەوانی کردووە. بە تەلیس و تەنەکە ئاڵتون رەوانەی ئەوروپا و ئەمریکا دەکەن. لە دەستی ئەوان ئەشکەنجەی بینیوە. لە ژێر ناوی ئاینەوە چ گەمە و تەڵەکەبازیەکیان ئەنجامداوە. لە ژێر ناوی ئیمام و مەلایەتی چ گەمە و ساختەکاریەکیان کردووە. تەواوی ئەمانەی بە چاوانی خۆی بینی. مەلا عەبدولڕەحمان لە میانەی وتەکانیەوە ئەمەی گوت" لەو بڕوایەدام کە مەلاکانی کوردستان لەم کارە تێدەگەن، دەیانەوێت و لە پێناویدا شەڕ دەکەن". داوای لێ دەکردن لە رێگای یەکێتی، سەربەخۆیی و ئازادیدا کار و خەبات بکەن.

لە شارەکانی بەدلیس، ئامەد، وان، مەلازگرد و سێرت گەلێک مەلا هەن. وەک بانگەشە دەکرێت مەلا وڵاتپارێزەکان دەیانەوێت کار و خەباتەکانیان بە پێشەنگایەتی PKK بڵند بکەن. ئەوانە هەنگاوی ڕاستن و دەرفەتێکی مێژووییە. ئێمە بە ساڵان لە هەوڵی هۆشیارکردنەوەی گەلی کورد دابووین. ووتمان یەکگرتووبن، ئەوە ئەرکی ئێوەیە. ئەگەر ئێوە ئیماندارن پێویستە ئەو کارە ئەنجام بدەن، لەگەڵ مرۆڤەکانیش دەبێت ئەوانە بکەن. ئێوە لەپێناو شەرەفی مرۆڤایەتیش

ئەو کارانە دەکەن. زۆر باش ئاگادارن کە بۆ شەڕەف و کەرامەتی مرۆڤایەتی بێجگە لەمە هیچ چارەیەکی دیکە نییە.

ولاتپاریزی نەبێت، ئایینیش نابێت. هەروەها سەربەخۆیی نەبێت، ئایینیش نابێت.

پێویستە لە نێو گەلدا یەکێتی ئاوا بکەن. لە مزگەوتەکاندا لەسەر ئەو لایەنانە قسەیان بۆ بکەن و وتار پێشکەش بکەن. لە ئێران، لە مزگەوتەکاندا شۆڕش دروست بوو. شۆڕشی هەرە مەزنیان لە مزگەوتەکاندا ئەنجامدا. لە مزگەوتەکاندا خوتبەو وتار پێشکەش دەکەن، کۆدەبنەوەو دەبنە پێش نوێژی گەل. یەکەمین وتارەکان لە ئیسلامیەتدا سەبارەت بە شەڕەکانی "بەدر"، و " ئوحد" و "خەیبەر" بوو. یەکەمین خوتبە لە دژی زوڵم و پاشڤەڕۆیەتی بوو.

خوتبەکانی سەبارەت بە داخلبوونی مەدینە و گەڕانەوە بۆ مەککە بۆ سەربەخۆییە. بەڵێ خوتبە بۆ سەربەخۆییە، بۆ پێشکەوتن، گەشەپێدان و هەستانەوەی مرۆڤەکانە.

ئێستا ئێمەش بە شارەکاندا بڵاو دەبینەوە. ئێمەش کۆچبەر بووین. بە دەیان ساڵانی تەمەنمان لە دیمەشق و ئەنقەرە بەسەر چوو. زۆربەی ئەوانە کۆچبەرییە. ئێمەش ئێستا وەکو ئیسلامیەت دەڵێین: بدەن بەسەر گوند و شارەکاندا. واتە مەبەستمانە شارە کوردیەکان رزگار بکەین. وەکو سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلام چۆن گوند و شارەکان رزگار دەکران، ئێستا PKK ـەش دەیەوێت شارەکانی خۆی رزگار بکات. دەیەوێت ئەو گوند و شارانەی لە ژێر نیزەی زوڵم و ستەم دایە، لە ژێر دەستی پاشڤەڕۆیان، خیانەتکاران و فاشتیستەکان رزگار بکات. ئیسلامیەت بۆ ئەمە دەستی بە رزگار کردن کرد. هی ئێمەش بەهەمان شێوەیە. ئیسلامیەت رزگار کردنە. پێویستە ئەوانە لە یاد نەکرێن.

کارەکانتان وەکو ئاو پاک و بێگەردە. دەتوانن لە مزگەوتەکاندا ئەو کار و خەباتانە بەرێوە ببەن، مزگەوتەکان بکەن بە قەلای بەرخودان. مزگەوتەکان ولاتپاریزی رۆشن دەکاتەوە.

بۆ سەربەخۆیی و یەکێتی ئەوە کاری ئێوەیە. ئێوە یەکێتی خۆتان دروست کردووە. بەهێزتری بکەن. لە کوردستان چەند مەلا و زانای ئایینی هەبێت، دیداریان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، با لەپێناو پارە خۆیان بە دەوڵەت نەفرۆشن. بۆ

وەرگرتنی پارەی دەوڵەت خیانەت لە گەل نەکەن. ئەو روو رەشانە لە نێو خۆتاندا رامەگرن و بەدەریان بنێن. لەژێر ناوی ئایینەوە لەناو خۆتاندا مەیانهێڵنەوە. ئەوان سیخوڕی فاشیستەکانن. من بڕوام بە مەلایانی وڵاتپارێزە، ئەوانەی گرێدراو و وابەستەی ئایینن، تەریقەتی راستگۆ و دروست یش هەیە، بڕوا دەکەم رێز لە ئایینی ئیسلام دەگرن. باوەڕیان بە خوداو پێغەمبەر هەیە، هەتا بڕوایان بەوەیە کە بێجگە لە سەربەخۆیی و ئازادی موسلمانێتی راستگۆو راستەقینە مەحاڵە و مومکین نییە.

ئایین باش دەناسم. منیش بە سالآن نوێژم کرد و رۆژووم گرت. ئەمانەش منیان بە سەربەخۆیی و ئازادی گەیاند. زۆر باش ئاگادارم کە شتێک لەوە گرنگتر بوونی نییە. کەسە دڵسۆز و راستگۆکانیش لە دەرەوەی ئەوە مومکین نییە کە شتێکی دیکە ئەنجام بدەن. بە کورتی و جەوهەری ئەمەتان پێ دەڵێم؛ ئێوە لە زۆر کەس زیاتر، لەژێر پێشەنگایەتی و رێبەرایەتی PKK و لە ژێر ناوی ERNK (بەرەی رزگاری نەتەوەی کورد) ئەوەی لە دەستتان بێت جێبەجێی بکەن و درێغی مەکەن. بەر لە هەر کەسێک ئێوە پڕوپاگەندە بۆ گەل بکەن. سکرتێری یەکێتیەکەتان هەڵبژێرن. خۆتان رێکخستە بکەن. ئەم کارە لە گوندو شارەکاندا ئەنجام بدەن. بە شێوەیەکی تێکهەڵکێش و لەناو یەکتردا ئەنجامی بدەن، هەر شوێنێک دەستتان پێی رادەگات، لەوێ ئەم خەباتە بکەن. ئەوە ئەرکی ئێوەیە. بە شەو و رۆژ ووتار پێشکەش بکەن و بەردەوام بن لە کار و خەباتەکانتاندا و رێکخستن بکەن. لە شەڕی گەریلادا هاوکار بن. کەموکورتیەکانتان سەرەراست بکەن، گەل بەرەو گەریلا ئاراستە بکەن. دوعاو نزایان بۆ بکەن. لەو رێگایانەوە گەل بکەن بە یەک و یەکگرتوویان بکەن. ئەوە کار و خەباتێکی مەزن و بەهادارە.

لەو بڕوایەدام ئەگەر ئەو کارو خەباتانە نەبن و ئەنجام نەدرێن: ئەوا نەتەوە، گەل، مرۆڤایەتی و ئاییندارێش نابێت. بۆیە سەرنج رادەکێشینە سەر ئەو بابەتە. مەلا عەبدولرەحمان تەمەنی ٩٩ ساڵانە. رێز و حورمەت نیشانی ئەو مرۆڤە دەدەم. سڵاوی ئەو مرۆڤە شۆڕشگێرەتان ئاراستە دەکەم. دڵنیام کە ئێوەش لە مێژووی کوردستاندا، لەو قۆناخەدا رۆڵێکی مەزن، کار و خەباتێکی مەزن ئاراستە دەکەن و ئەرکەکانی خۆتان جێبەجێ دەکەن.

خۆتان بچووک نەبینن، هەرچەندە تا ئێستا لە رێگای راستدا خزمەتێکی باشتان نەکردووە. بەڵام هۆکارەکەی لە ئێوەوە سەرچاوە ناگرێت. دەرفەتەکانتان ئەوەندە بوو. بەڵام ئێتر دەزانن کاتێک PKK سەریهەڵدا، یەکێتی گەلی کوردی

دروست کرد. ئەو یەکێتییە، وەکو ئەرکێکی جێبەجێکردنی فەرمانی شەهیدان هەوڵدراوە کە جێبەجێ بکرێت. لەمیانەی بەرخودانەوە ئێوەش بە ئامانجەکانتان دەگەن. بەڵێ ئەوەی کە ئایین باسی دەکرد، روویدا.

ئێستا ئێوەش بە بێ ترس و بە فیداکاریەکی مەزنەوە دێنە سەر رێگای قارەمانێتی. ئێمەش لەگەڵ ئەو هەنگاوەداین و ئەنجامی بدەن. ئەوەی لەژێر ناوی شۆڕشگێریەوە باسی شتە خراپەکان دەکات، مسۆگەر لە ئێمە نییە. نابێت بکەونە بەر بای ئەوانەوە. ئایینداراني ساختە، لە ژێر ناوی ئایینەوە خۆیان بە مووچەیەکەوە گرێداوەو لە دژی PKK کار دەکەن. بە PKK دەڵێن تیرۆریست. دەڵێن PKK لە ئایین دوورە. ئەوانە دووڕوون و بێ باوەڕن. پێویستە هیچ کاریگەریەکی ئەوانە لەسەر گەل نەبێت.

دووڕو و بێ باوەڕی هەرە مەزن، ئەو کەس و لایەنانەن کە گەل لە رێ دەر دەخەن، لەپێناو مووچەیەک خۆیان دەفرۆشن.

ئەو جۆرە کەسانە لە نێو خۆتاندا مەهێڵنەوە. چونکە ئاییندار نین. من بۆیە باسی ئەو خاڵە دەکەم تا لە کوردستان تەریقەتە ساختەکان، خائینەکان، ئەوانەی یەکێتی پەسەند ناکەن و بە مووچە کار دەکەن، ئاشکرایان بکەن. ئەوانە لە ئێمە نین. بەڵام کەس و لایەنە دڵسۆز و راستگۆکان، لایەنگرانی گەلی کورد تا دوا رادە با لەژێر پێشەنگایەتی و رێبەرایەتی PKK یەکبگرن. چ هاوکاری و یارمەتییەک پێویست بکات، PKK هاوکاریان دەبێت. کەم وکورتی هەبێت، سەرەراستیان بکەن و تێپەڕیان بکەن. بە ئێمەیان رابگەیەنن، ئەو کەموکورتیانەی ئێوە دەیانبینن لە ناویان دەبەین و سەرەراستیان دەکەین. لەمەوبەدوا داوای یەکێتیەکی بەهێز لە ئێوە دەکەین، داوای کار و خەباتێکی بە هێز دەکەین.

سڵاو و رێزی خۆم ئاراستەی سەرجەم موسلمانە راستەقینە و راستگۆکان دەکەم. گەلی باوەڕمەند و موسلمانانی راستەقینە زۆرن. دەکرێ ئەمە بە سەرجەمیان بڵێم؛ موسلمانێتی راستەقینە لە PKKدا دەژی. حەقیقەت و جەوهەری ئایین لە PKKدا بەرێوە دەچێت و پەرە دەستێنێت. ئێمە ئێستا لەناو شەڕو تێکۆشانداین. لەوانەیە نوێژ نەکەین و رۆژوو نەگرین. ئێوە دەزانن لە شەڕدا رۆژوو و نوێژ نابێت. بەڵام موجاهیدانی مەزن، درێژەپێدەرانی مەزنی ئیسلامییەت لە PKKدا بەرخودانی دەکەن و شەهید دەبن. خۆشتان دەزانن کە ئیسلامی هەرە

مەزن ئەوەیە. ئەوانە لە ئیسلامیەتدا، بە خزمەتەکانیان ڕێگای شەڕەف بۆ هەر کەسێک دەکەنەوە. ئەرکە ئایینییەکەیان جێبەجێ دەکەن.

سڵاو و ڕێزی خۆم ئاراستەی موسلمانانی ڕاستەقینە و دڵسۆزی کوردستان و گەلی ڕاستەقینەی ئیسلام دەکەم. لەمەو بەدوا هیوای کار و خەباتێکی بەهێز لە پێناو ئازادی و سەربەخۆیی بۆ هەمووتان دەخوازم. هیوادارم لەمەوبەدوا کار و خەباتی مەزنتر بۆ کوردستان ئەنجام بدەن.

لەو ڕێگایەدا هیوای سەرکەوتن لە کار و خەباتەکانی یەکێتی مەلایانی وڵاتپارێزی کوردستان، سەرجەم موسلمانانی کوردستان و هەموو موسلمانانی جیهان دەخوازم. بە هەستی هەرە دڵسۆز و قووڵمەوە سڵاو و ڕێزی خۆمتان ئاراستە دەکەم. هەموو شتێک لەپێناو بەدیهێنانی سەربەخۆیی و ئازادییە.

سکرتێری گشتی PKK

گوڵانی ١٩٩١

# ئایین ڕێبەرێکی ئایدیۆلۆژی تێکۆشانە

ئەو گرووپەی لە زانکۆی ئەزهەرەوە هاتبوو لێرە خۆی بوو بە وەڵامی ئەو توێژینەوەو لێگەڕینەی هەوڵی بۆ دەدا و سەرقاڵی بوو. بەڵێ بەدرێژایی مێژوو لێگەڕینی ئەزهەر گەڕان بووە بەدوای حەقیقەتدا، لێگەڕینەکەی ئێرەش لە لایەنێکەوە لێگەڕینێکی سیاسییە. ئێستا خۆتان بە شێوەیەکی باشتر بینیوتانە کە ڕووبەڕووی چۆن ئەرکێکن. ئەگەر مرۆڤ نەزانێت و ئاگادار نەبێت کە بە ئەندازەی هەبوونی ناسنامە مێژووییەکەی لە هەمانکاتدا ئەرکی ڕۆژانەییشی هەیە ئەوا ناتوانێت لێگەڕینەکەی خۆی دەست پێبکات، لەم سۆنگەوە؛ ناتوانێت خۆی بناسێت و پەرە بە کەسایەتیەکەی بدات. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە ئایدیۆلۆژیای فەرمی لەمیانی کاریگەریەکانی بەسەر ئیسلامیەتەوە دەتوانێ بەدرێژایی تەمەن مرۆڤ بە خۆڕایی بژێنێت و تەنانەت بیکات بە نۆکەر و خزمەتکاری خۆی.

ئەو مەکتەبەی ئێرەمان ئێمە بە ناسنامەی ڕاستەقینەو ئەرکەکانمان دەگەیەنێت، دەمانباتە سەر ڕێگای ڕاست . هەڵبەتە بەو ڕادەیەی ڕێزی مرۆڤ بەرامبەر بە ناسنامە و ئامانجەکەی بەرز دەکاتەوە، هەروەها چانسی سەرکەوتنیشی پێشکەش دەکات. ئەو شتانەی لەم ماوە کورتەدا لەو مەکتەبە فێری بوون ئەگەر لەگەڵ ژیان، زانست و سیاسەتدا یەکانگیریان بکەن، ئەوا لە کەسایەتی ئەو گرووپە بچووکەدا ڕێگا لەبەردەم ئەنجامی گەورە و گرنگ دەکاتەوە.

گفتوگۆی هەمەجۆرمان پێشخست. پەیوەندی ئایین ـ سیاسەت بە تایبەتی لە ئیسلامیەتدا زۆر دیار و بەرجەستەیە. دەستپێکی ئیسلامیەت سیاسەتە. بە

تایبەتیش لەسەر بنەمای شۆڕشێکی زۆر گرنگ سەری هەڵداوە. بە درێژایی مێژوو بۆتـە ڕێبـەرێکی ئایـدیۆلۆژی تێکۆشـانی سیاسـی مـەزن. لەمیانـەی ململانـێ و پێکدادانی چەپڕەو ـ ڕاستڕەویەوە بە درێژایی مێژوو و تا ڕۆژی ئەمڕۆمان وەک یـەکێک لـە ئایینـە هـەرە بـە کاریگـەرەکان جێگـای خـۆی گرتـووە. بـە تایبـەتیش سـەبارەت بـە گـەلانی ڕۆژهـەڵاتـی ناوەڕاست، بـەگوێرەی سـەردەمی خـۆی بۆتـە هۆکار و سەرچاوەی پەرەسەندنی مەزن. لەم چوار چێوەیەدا خزمەت و کۆمـەکی گرنگی پێشکەش بە نەتەوەبوون و پەرەسەندنی کۆمـەڵایـەتی عەرەبەکان کردووە. هــەروەها ڕۆڵێکــی گرنگــی گێــڕاوە لــە پەرەســەندنی داگیرکــاری فارســەکان و بەتایبـەتیش داگیرکـاری تورکـەکان. بـێ گومـان ڕەوتـی کۆنەپەرسـتی مـەزنیش دەرکــەوتوون: ئەمانــەش ڕێگایــان لەبــەردەم پاشــڤەڕۆیــەتی و محافــەزەکاری کردۆتەوە.

بە تایبەتیش لەم چەند سەدەیەی دوایی تا دەگاتە ڕۆژی ئەمڕۆمـان، ئایین بە دەستی ئیمپریالیزم و چینە سەردەستەکان بۆتـە ئـامرازێکی گرنگی ئایـدیۆلۆژی و لـەمیانی محافەزەکاریـەوە دەیانـەوێت وەکـو کۆسـپێک لەبـەردەم پەرەســەندنە کۆمـەڵایـەتی ـ نەتـەوەییـەکانی گـەلانی هـەرێم بـەکاری بهێنن. بـە تایبـەتیش کاتێک وڵاتەکـەمان و ڕاسـتینەی نەتـەوەییمـان مـژاری بـاس بێـت، ئـەوا شـرۆڤەکردنی ئیسـلامیەت و پراکتیکەکـەی بـە تـەواوەتی بەشـێوەی نکـوڵیکردن، پەرەپۆشـکردنی ڕاسـتییەکان و دروسـت کردنـی دامـەزراوەی گرنگـی سـیخوڕی، نۆکـەری و بەکرێگیراوی بەکار هاتووە. بەڵێ ئایدیۆلۆژیەکەی پێکهاتووە. لە خۆیانـەوە دەڵێن: "خودا وەهای فەرمووە، پێغەمبەریش وەها دەڵێت، لە قورئاندا بەمجۆرە نووسراوە، حەدیس یش وەهایـە" بـەمجۆرە ئیسـلامیەتیش لـە جەوهـەرەکـەی خـۆی دادەبڕن و وەکو ئامرازێکی هەرە پاشکەوتوو و خراپ دژ بە تەواوی گەلەکەمان بەکار دێنن؛ دەیخەنـە ڕەوشـێکەوە خـۆی نەناسـێت، بـێ ئامـانج و دەسـت بـەتاڵ بێـت، لـەو سۆنگەوە؛ بۆ هەر جۆرە گوشار و چەوسانەوەیەک کراوە دەبێت. لە هەر شـوێنێک ئایین بە گشتی و ئیسـلام بە تایبـەتی سـەرەکیترین ڕۆڵـی ئایدیۆلۆژی گێڕاوە لـە بەربەسـتکردنی پەرەســەندنی نەتـەوەیـی ـ کۆمـەڵایـەتی گەلەکـەمان و هۆکـاری گەیشتنیەتی بەو ڕەوشە ترسناکەی ئەمڕۆ تێیدا دەژیت.

ئەوەی دەمانەوێ لێرەدا شی بکەینـەوە: ئـەم دۆخـە لەگـەڵ گەوهـەری ئایین و ئیسـلامدا ناگونجێت، بـەڵکـو بـە تـەواوەتی مەسـەلەیـەکی سیاسـی ـ کۆمـەڵایەتییـە، کەسـانێکی چـاوچنۆک ئایینیـان لـەپێناو بەرژەوەنـدی خۆیـان بـەکار هێنـاوە، ئـەرکی

ئێمەش کۆتایی هێنانە بەو شێوازەی بەکارهێنان و قۆستنەوەی ئایین، لەجیاتی ئەمە پێویستە بە گوێرەی ئایین و فەرمانەکانیەوە مافی گەلان و مافەکانی مرۆڤ بخەینە ڕوو، لەم بوادەدا هیچ تەعویزێک نەدەین و بەمجۆرە هەڵوێستێکی گونجاو بە ئایین پێشبخەین. لە بواری کرداریدا ئەوەشمان تێپەراند. تا ڕادەیەکی زۆر ئایینیش ڕزگاری نەتەوەیی تاوتوێ کردووە و تیشکی خستۆتە سەر. پەروەردە ئەوەی ڕوون کردۆتەوە. لە کار و خەباتەکانی داهاتوودا پێویستە ئەو مژارە زیاتر پەرەی پێ بدرێت و پێشبخرێت.

ئەگەر لە زانکۆی ئەزهەریش بێت کاتێک ئەو ئایینە دەخوێنرێت، پێویستە هەڵنەخەڵەتێین و بپرسین ئەوە وێڕای ئەو شتانەی فێری بووین چی بە ڕزگاری نەتەوەیی دەبەخشێت و چی لەگەڵ خۆیدا دەبات؟ لەو بوارەدا چەندە ئەرکەکان دەخاتە ڕوو؟ چەندە زیانبەخش دەبێت، ئایا دیار دەبێت؟. هیچ کاتێک ئایین بریتی نییە لە کەڵەکەبوونی قسەی وشک و قەرەباڵغ. لەناو زۆربەی گەلاندا؛ لە ئەفغانستانەوە تا جەزایر، لە بۆسناوە تا دەگاتە چیچان ئەو زانیاریانە وەکو ناوی چالاکیەکی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسی ڕۆڵ دەبینێت. ناڵێم ئێمەش وەکو ئەوان هەمان شت بکەین، بەڵام زۆر وانەو ئەزموون هەیە کە لێیان وەربگرین.

ئەگەر ئێوەش وەک ڕەنگێکی ئیسلامی خزمەت و کۆمەکێکتان بۆ تێکۆشانی ڕزگاری نیشتمانی دەبێت، ئەوا پێویستە ئێمەش بەلانی کەم هێندەی ئەو گەلانە و جەنگاوەرێتیە ڕێکخراوەکەیان، لەپێناو گەل و وڵاتی خۆمان لەم ڕێگایەوە پەرە بە شەڕڤانێتیەک بدەین. ئەمە ئەرکێکە. لە ڕەوشێکی پێچەوانەدا لە دۆخی بەکرێگیراوێتیەکی هەرزان ڕزگارتان نابێت. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا موجاهیدان لە زۆر شوێنی جیهان شەڕ و تێکۆشانێکی بە بڕیار بەڕێوە دەبەن. لە لایەنی کاریگەریەوە وڵات و گەلەکەشیان وەکو ئێمە داگیرکراو و کۆیلە نین. سەرەرای ئەمەش دیسان دەووترێت "جیهاد فەرزە". لە جیهاندا هیچ وڵاتێک وەکو وڵاتی ئێمە تێیدا جیهاد فەرز نییە.

لەسەر ئەو بنەمایە ئەگەر دەتانەوێت لەمیانی چالاکیەوە هەڵوێستێکی تەندروستانە سەبارەت بە ئەرکە هەنووکەییە ئیسلامیەکان پیشانبدەن، مسۆگەر وەک گرۆپێکی وڵاتپارێز پێویستە لەپێناو کوردستان و تێکۆشانی ڕزگاری نەتەوەیی لە ئاستی پێشەنگایەتیدا خۆتان بۆ ئەرکە سەرەکیەکان ئامادە بکەن. بێجگە لەمە هیچ ڕێگایەکی دیکە نییە. دۆخێکی پێچەوانەش خۆ هەڵخەڵەتاندنە، لە

ژیاندا بە ئاستێکی بێ بانگەشەتان دەگەیەنێت و کەسایەتیتان نامێنێت. بۆ ئەوەی ئەو رەوشە روونەدات، هەرچیەک دەکەن هێزی ئایدیۆلۆژی ئیسلامیش بەکار بهێنن و هەڵوێستێکی شۆڕشگێری بۆ کێشەی نەتەوەیی – کە ئێمە بۆ ئەمە لە هەڵسەنگاندنی جۆراوجۆرماندا روونمان کردبووەدا – پیشان بدەن. تەنانەت تا دەگاتە ئاستی لێکۆڵینەوەو گەیشتن بە بەرنامەیەک و پڕاکتیزەکردنی لە باری کرداریدا قورسایی پێ بدەن. بەمجۆرە هەنگاو بە هەنگاو ئەو رێکخستنانە ئاوا بکەن کە هێز و تواناتان بڕی دەکات، یەک لە دوای یەکتر پێشیانبخەن و پەرەیان پێبدەن.

وەک چۆن لە رێگای سۆسیال ـ شۆڤینیزمی چەپڕەوێتیەوە پەیڕەوکردنی سۆسیالیزمیان دەرهەق بە کێشەی نەتەوەییەوە ئاستەنگ کرد، لە ئیسلامیەتیش لەژێر ناوی "ئومەت" ـەوە رێگری لە جێبەجێکردنێکی راستی ئیسلام سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی کراوە. بگرە دەکرێ بڵێین بە شێوەیەکی زۆر مەترسیدارتر لە هی چەپڕەوێتی ئەو رەوشە بە خەساندنی کۆمەڵایەتی و شۆڤینیزم گەیشتووە، لەسەر بنەمای نکوڵیکردن هەڵوێست بەرامبەر کێشەی نەتەوەیی پیشاندەدەن. لە کاتێکدا بە شۆڤینیترین شێواز بەرگری لە راستینەی نەتەوەیی خۆیان دەکەن، بەڵام کاتێک قسەیەکی هەرە بچووک سەبارەت بە کورد دەکرێت ئێوە بە "نەژادپەرست" لە قەڵەم دەدەن. هاوشێوەی چەپڕەوە ساختەکان ئەو ساختە موسلمانانەش گەورەترین درۆزن و دووڕوون، ساختەکارن و هیچ پەیوەندیەکیان بە بنەڕەت و راستیەکانی ئایینەوە نییە. لەم سۆنگەوە؛ لە دژی ئەو گرۆپە موسلمانە ساختانە پێویستی بە تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی کاریگەر هەیە. ئەمە ئەرکی سەرەکییە.

ئەم جۆرە گرۆپ و پارتیانەی لە تورکیاو بگرە لە کوردستانیش زۆرن و دەبینرێن، پێویستە لەمیانەی تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژیەوە نەهێشتنی کاریگەریەکەیان لەسەر گەلەکەمان و تەنانەت گەلی تورکیاش بکەین بە ئەرکی سەرەکی خۆمان. مسۆگەر پێویستە ئەو شێوە چەواشەکراوەی ئایدیۆلۆژیای ئایینی تێپەر بکەین کە لە سڕکردن و بێ هۆشکردنی گەلاندا بەکار دەهێنرێت. ئەمەش پێویستیەکی دەست لێبەرنەدراوی راست بەکارهێنانی ئایینە. بێگومان پێویستە لە رێگای تێکۆشانی ئایدیۆلۆژیەوە ئەم کارە ئەنجام بدەن، بە شێوەیەکی زارەکی بێت، یان نووسین و نامیلکەو بەکارهێنانی رۆژنامەکان ئیتر پێویستە درۆو دەلەسەکانیان ئاشکرا بکەن. وەک چۆن ئێمە تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی سەرکەوتوومان بەرامبەر بە چەپڕەوە ساختەکار و سۆسیال شۆفینستەکان ئەنجامدا، ئێوەش بە هەمان شێوە تێکۆشانی

ئایدیۆلۆژی ئەنجام بدەن. لە سەرەتای ١٩٧٠ كانەوە تا كۆتاییەكەی سەركەوتووانە ئەو تێكۆشانە ئایدیۆلۆژیەمان ئەنجامداو تا رادەیەكیش كۆمەكێكی مەزنی پێشكەش بەپێكهاتن و شێوەگرتنی PKK كرد.

ئەگەر لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا بە شرۆڤەو هەڵسەنگاندنێكی راستی ئیسلام رووبەڕووی ئەو موسلمانێتیە ساختەی تورك ببنەوە كە لە ژێر ناوی ئایین پەرەیان سەندووە، لەو مژارەدا پارتیبوونێك پێشبخەن، لە چوارچێوەی بنەڕەتەكانی ئایین و رزگاری نەتەوەیی و دژە فاشیزمیشدا لە پەرەپێدانی ئایدیۆلۆژیادا سەركەوتووبن ـ كە ناوی ئەمە بەرخودانە، چالاكییە ـ هەروەها كردارەكانیشتان بەم شێوەیە بێت؛ لە راستیدا هەم بۆ توركیا، هەم بۆ كوردستان ئەركێكی گرنگ سەردەخەن. نەك تەنیا لەنێوان خوێندكارە گەنجەكانی كوردان، بەڵكو تێكۆشانێكی ئایدیۆلۆژی بەرفراوان لەنێوان ئەو گەنجانەی لە توركیاشەوە دێن، دەشێ رێگا لەبەردەم پێشكەوتن و گەشەكردنێكی مەزن بكاتەوە. لەم پێناوەشدا تێكۆشانێكی بەردەوام بەرامبەر چەواشەكاری ئایینی ـ كە نموونەی لە مێژوودا زۆرە ـ لە دژی مونافیقی و دووڕوویی، لە دژی مەزهەبگەرایی ساختە بەرێوە چووە.

خودی شیعەتی تێكۆشانێكی ئایینییە لەبەرامبەر پەلهاوێشتن و بەرفراوان بوونی ئەمەوی ـ سوننە. عەلەویتیش بە هەمان شێوە تێكۆشانێكی مەزهەبی ئایینییە لە دژی باڵادەستی سوننەی دەسەڵاتدار. پێشخستنی تێكۆشانێكی بەمجۆرە بە تەئكیدەوە بۆ ئێمەش پێویستیەكە و راستیشە. هەروەها چەندین تەریقەتی ساختەش هەیە. لە دژی ئەو هەموو تەریقەتە ساختانە پێویستە خۆمان رێگای تەریقەت یان مەزهەبی هەرە باش بدۆزینەوە. ئەركی هەرە سەرەكی و بنەڕەتیمان، جێبەجێ كردن و پراكتیزەكردنێكی سەركەوتووانەی شرۆڤەیەكی بەم چەشنەیە سەبارەت بە كێشە نەتەوەیی و كۆمەڵایەتیەكان و پیشاندانێتی بە شیوازێكی ملیتانانە. بە ئەندازەی سەركەوتن لە ئەركەكەنماندا، هێندەش واتە بە ژیانی خۆمان دەبەخشین.

ئامانجی ئایینیش ئازادییە. كەم تا زۆر پێویستە بە ئازادی بگەن، بە پێچەوانەوە لە ژێركاریگەری ژیانێكی پووچدا دەڕزێن و ناتوانن خۆتان رزگار بكەن. زمانی ژیان، ئەمەمان پێدەڵێت. شۆڕش ئەوە دەڵێت. بە شێوەیەكی روون و ئاشكرا پێمان دەڵێت كە بێجگە لەمە رێگایەكی دیكەی ژیان و رزگاری نابێت. ئێوە

لێرە بناخەی ئەوەتان دانا، لەسەر ئەو بنەمایەش لەمەوبەدوا بە یەکەوە ڕێگای ژیان دەگرنە بەر.

پێویستە خۆتان هەوڵ و کۆشش بدەن، خۆتان بە زەلالبوون بگەیەنن. بە جێبەجێ کردنی ئەو هەنگاوە ژیانتان واتادار دەبێت، لەمیانی دەستەبەرکردنی واتای ژیانیش تێکۆشانتان زیاتر دەبێت و بەرەو لوتکە هەڵدەکشێن. لەمەو بەدوا هەر پەرتووکێکی کە دەیخوێننەوە پێویستە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی بە ژیان و مێژووەوە هەبێت. هەروەها هەر قسەیەک کە دەیکەن و هەر وتارێکی پێشکەشی دەکەن پێویستە پەیوەندی بە ڕزگاری و ڕێکخستنەوە هەبێت. بێجگە لەمە ڕێگاو دەرفەت بەوە مەدەن خۆتان و مێشکتان بە شتی بێ ماناو پڕو پووچ خەریک بێ.

گەنجن و ڕەنجێکی زۆرتان داوە، پێویستە بزانن چۆن ئەنجامەکانی بەدەست بێنن. ڕێگای ئەقلیش ئەمەیە. کاتێک مرۆڤ گرێدراوی خەیاڵ و ئایدیاکانی بمێنێتەوە، لەپێناو بەدیهێنانیان سەرجەم هەوڵەکانی بکاتە یەک و چڕیان بکاتەوە، ئەوا مسۆگەر شکۆدار و مەزن دەبێ. لە دۆخێکی پێچەوانەدا، ژیان دەبێتە بەڵای سەریان. هەڵخەڵەتاندن لە ژیاندا خراپترین ئەنجامە کە مرۆڤ ڕووبەڕووی دەبێتەوە. تاکە ڕێچکەی دەرفەت پێ نەدان و بەربەستکردنی هەڵخەڵەتاندن، دەستنیشانکردنی ڕێگای ڕاستەقینەو بە سووربوونەوە مەشە بەو ڕێگایەدایە. ژیانی ڕابردووتان، ئاڵوودەبوون و دابونەریتەکانتان هەر چەندە کۆسپ و تەگەرەشتان بۆ دروست بکات، دەرفەتی پێ مەدەن. تا دوایی بە شێوەو شێوازێکی بە بڕیار، خاوەن بانگەشە و سەرکەوتووانە درێژە بە ڕێگاکەتان بدەن. هەڵوێستی ڕەسەن و شکۆداری پارتەکەمان سەبارەت بە چین و توێژەکان و تەواوی مرۆڤایەتی، وەک گشتی بۆ ئێوەش ڕێبەرنامەیە. پارتەکەمان لە هەمانکاتدا پارتیەکە کە هەڵوێستێکی شۆڕشگێری لە بەرامبەر ئایین پێشخستووە. هەڵبەتە ئەمە ڕوناکی بە ئێوەش دەبەخشێت. کاتێک لەگەڵیدا ببنە یەک، بەو هێزەی لێوەی وەردەگرن، بە بێ هیچ گومانێک بارەکەتان سووکتر دەبێت. پەرەسەندنێکی هێندە خێرا بەخۆوە دەبینن کە بە خەیاڵیشا نایەت. هەروەها لەمیانی ئەو پەیوەندییانەی بە ڕەنجی خۆتان یاخود لە ڕێگای ڕێکخستنەوە لەگەڵ گەل دروستیان دەکەن، هەروەها لە ڕێگای ئاواکردنی ڕێکخستن، زیاتر وابەستەی ژیانتان دەکات، واتای ژیانتان زیاتر دەبێت و بەم شێوەیە بە بڕیارێکی بەهێزەوە جێگای خۆتان لە ڕزگاری نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیدا دەگرن.

له سهر ئهو بنهمایه لهو بڕوایهداین که بهو ئهنجامانهی لهو خولهی پهروهرده بهدهستتان خستووه، ڕهوتی ژیانتان به تهواوهتی گۆڕاوه و به زانستێکی زیاترهوه بهرهو ڕێگای ڕاست ئاراسته دهگرن و سهرکهوتنێکی مهزن بهدهست دێنن. لهمیانی ههر جۆره ڕهنج و ههوڵدانێک که بهشێوهیهکی ڕۆژانه پێشیان دهخهن، ههروهها له ڕێگای ئهو پهیوهنییه نوێیانهی لهگهڵ سهرجهم ئهو مرۆڤانه دهیبهستن که دهیانناسن، شانبهشانی ئهو کار و خهباته خێرایهی به شێوازێکی بهرنامهیی – ڕێکخستنی بهڕێوهی دهبهن ڕێژهتان زیاتر دهکات و وهک لقێکی مهزنی تێکۆشان جێگای خۆی له دڵی گهلهکهماندا دهکاتهوه. بۆ ئهمهش دهبێت ئافرێنهر بن و ڕێبازی کار و خهباتی ڕۆژانهتان بهشی ئهوه بکات. پێویسته وهکو ههنگ کار بکهن و به خێرایی ژمارهی خۆتان زیاتر بکهن و پهره به چۆنیهتی گرووپهکهتان بدهن. پێویسته له زووترین کاتدا وهک پڕوپاگهندهچیهکی زۆر باش، تهنانهت ڕێکخهر و موجاهیدێکی چالاک دهرکهونه پێش گهل.

پارتیمان زهمینهی پێویستی بۆ ڕهخساندوون، ڕێنمایی خۆی پێشکهش کردوون، ئهوهی دیکهش پهیوهسته به ڕهنج و ههوڵدانی خۆتانهوه. لهسهر ئهو بنهمایه لهو بڕوایهداین که ئهو گرووپهشمان بهشداری ڕێپێوانی سهرفیرازی دهبێت و به سهرکهوتنی گرنگ دهگات. گرووپێکی به ڕێکخستنه، گرووپێکی بهرپرسیاره. دهزانێت چۆن لهسهر بنهمایهکی ڕاست و دروست کار و خهبات بکات، بێ گومان لهو چوارچێوهیهشدا سهردهکهوێت.

بهر لهوهی بهرێ بکهون به کورتی پێویسته سوێندێک بخۆن. به ئامادهبوونی هاوڕێیانتان به کورتی خۆتان دهناسێنن، چین ئهو شتانهی له خولهکهدا پێی گهیشتوون، دواتر دهتوانن سوێندی بهرێکهوتن و بهڵێنهکهشی بدهن. بهڵێ، به نۆره، یهک به یهک. بهڵێ، خۆت بناسێنه.

ها: ناوم (ها). له ساڵی ١٩٧٠ له دایک بووم. خوێندنگهی سهرهتاییم له شاری ئامهد تهواو کردووه. خوێندنگهی ناوهندی و ئامادهیی "ئیمام خهتیب" م له دهرهوه لهمیانی بهشداریکردنی ئهزموونهکان تهواوم کرد. له تهنیشت باوکم قورئانم لهبهر کرد. له ساڵی ١٩٩٣ تێپهری قاهیره بووم. له ههمان ساڵدا ناوی خۆم تۆمار کرد. جارێکی تر گهڕامهوه. له ساڵی ١٩٩٤ له کۆلێژی حقوقدا خۆم تۆمار کرد. هێشتا له پۆلی یهکهمدا دهخوێنم. هاتمه ئهکادیمیای ناوهندی پارت. ئهو هێزهی که

ڕێبەرایەتی پێی داوم، ئێستا هەست بە هێزێکی زۆر لە خۆمدا دەکەم. سەرکەوتن بنەما و بناخەکەم دەبێت.

سەرۆک:... سەرەتای دەستپێکردنی خولەکە چۆن بوویت و ئێستا چۆنی؟

ها:سەرەتای دەستپێکردنی خولەکە زۆر بێ هێز بووم. ئەوەی خوێندبووم لەگەڵ کردارەکانم یەکتریان نەدەخوێندەوە و لە یەکتر جیاواز بوون. لێرە بەهێز بووم و هەوڵمدا بیخەمە بواری ژیانەوە. هەوڵی گونجاندنیانمدا. دەتوانم بڵێم کە گونجاندمن. لەو بڕوایەدام کە لەمەوبەدوا لە چوارچێوەی ڕێنماییەکانی ڕێبەرایەتی و لەژێر گەوهەری ڕاستەقینەی ئیسلام تەڤگەر دەکەم.

سەرۆک: بە ڕاستی جیابوونەوەیەکی مەزن و بەرچاو لەناو ئەو شتانە ڕوودەدات کە فێری بوویت؟ وابزانم ئێستا دەزانی چۆن ڕزگاری نەتەوەیی ئاراستە بکەی و لەسەر ئەو بنەمایە هێزی ئایدیۆلۆژی ئیسلام بەکار بێنی، ئیتر لە چۆنێتی بەکارهێنانی تێگەیشتوون.

ها: ڕاستە.

سەرۆک:... پێداگری و ئیرادەت پێشکەوتووە؟ لەو بڕوایەدای کە بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەو چەکە شەڕ بکەی؟ گەلەکەمانیش باش دەناسی. بە بڕوای من لەمیانی بەکارهێنانی ڕاستینەی وشەی ئایین و کردنی بە شێوازێکی تێکۆشان وەکو ملیتانی هەرە باوەڕپێکراو کارو خەبات بکەن.

ها: کار و خەبات دەکەم سەرۆکی من.

سەرۆک:... جیاواز لەمە؟ پەیوەندیدار بە ژیانەوە، ئەوەی لێرە وەرتگرتبێت، یا خود لەمەوبەدوا جێبەجێی بکەی، پەیوەندیدار بەو شتانەی کە بیکەی یاخود شتێک کە ڕاوەستەی لەسەر بکرێت...

ها: بەسەر ئەمەدا دەچم، کاتێک هاتم بۆ ئێرە، وەکو نەخۆشێک بووم، وەکو نەخۆشێک کە تووشی شێرپەنجە بووە، بەردەوام بەرەو لەناوچوون دەرۆیشتم. دەتوانم بڵێم لێرەدا هەموو لایەنە کەموکورتیەکانی خۆمم بینی، توانیمان لە سەدا ۹۰ ی ببینین و هەوڵی تێپەڕاندنیشمان دا. بە دڵنیاییەوە دەتوانم بڵێم کە تەواوی ئەو هێزەم لە ڕێبەرایەتی وەرگرتووە. هاوڕێیانیش لەم مژارەدا هاوکار بوون. تا ڕادەیەکی زۆر پێشکەوتین و بەردەوام دەبین لە پێشکەوتن.

سەرۆک:... واتە تا دوا ڕادە سووربوون و ئاستی بڕیارداریت دەستەبەر کردوە؟

ها: بەڵی سەرۆکی من.

سەرۆک:... فەرموو، تێپەر بن. با هەڤاڵی دواتر بێت. تۆش خۆت بناسێنە.

مە: ناوم (مە). لە ساڵی ١٩٦٨ لە شاری ئەرزروم لە دایک بووم. لە ساڵی ١٩٨٢ خوێندنگەی سەرەتاییم تەواو کرد. ماوەی دوو ساڵ لە کوردستان لە مەدرەسە خوێندم. دواتر دەربازی ئەو هەرێم(گۆڕەپان) ـە بووم، چوار ساڵ بە فێربوونەوە خەریک بووم. ساڵی ١٩٩٠-١٩٩١ چوومە قاهیرە. لە قاهیرە دەربازی زانکۆی "ئەزهەر" بووم. ئەو ساڵ چوارەمین ساڵمە، لە پۆلی کۆتاییدام. لە دوای ئەوەش دەربازی ئەکادیمیای ناوەندی پارتی(PKK) بووم.

سەرۆک:... لێرە فێری چ بووی؟ جیاوازییەک لە نێوان ڕوانگەی پێشوو و ئێستای تۆدا هەیە؟

مە: سەرۆکی من، پێشتر هەموو شتێکمان لە کتێبەکاندا دەخوێندەوە و دەمانەویست لە بواری تیۆریەوە لێی تێبگەین. ئەو زانستانە نە واتایەک و نە پێکهات و جێبەجێ کردنێکی کرداری هیچ یەکێکیانی نەبوو. لە ژیانێکی زۆر خرابدا بووین. بەو ڕەوش و دۆخەمانەوە تێپەری ئەو گۆڕەپانە بووین. بە ڕاستیش لێرە هێزمان وەرگرت، توانامان بەدەست هێنا. لێرەدا جیهادی ڕاستەقینەمان بینی کە لە کتێبەکاندا خوێندبوومانەوە و لە ئەکادیمیادا گفتوگۆمان لەسەر کرد.

سەرۆک:... کەوتوونەتە ژێر بارێکی قورسەوە. واتای باری قورس و مەزن چییە، زۆر شتت خوێندۆتەوە و فێری بووی. بەڵام ئەوانە پەیوەندی و گرێ نەدراوە بە ڕاستی گەل و وڵاتەوە. هەتا لەگەڵ حەقیقەتەکانی دیکەش پەیوەندیتان دروست نەکردووە. واتە ئەمە ڕەوشێکی خۆ هەڵخەڵەتاندنە. لێرەدا بارێکی قورس لەسەر شانەکانت لابرا. لێرەدا بڕوا بە خۆبوون زیادی کرد. بڕوا و باوەڕیت لەو بارەوە زیادی کرد کە دەتوانی ئەو بارە قورسە هەڵبگری. بەم شێوازە زۆر بە ئاسانی دەتوانن خۆتان ڕێکخستن بکەن.

مە: دەتوانم بڵێم کە خستنە ڕووی ئەو بارە قورسە لەبەرامبەر بەراستی کوردستان و ڕاستی گەل مومکین نەبوو. لە نێو گەلێکی ونبوودا هاتوچۆمان دەکرد. بە بەردەوامی پێش چاومانیان پەردەپۆش دەکرد. بەرامبەر بەو دۆخەش هیچ شتێکمان لەدەست نەدەهات.

سەرۆک:... واتە ئەو ئایینەی شۆڤینیزم خوڵقاندبووی، بە هێز بوو. شۆڤینیزمی عەرەب، فارس و تورک لەناو ئاییندا چاوەکانی ئێوەی کوێر کردبوو. واتا ئێوەی وەکو قەومی خۆی دەویێت، بەمجۆرە فێری دەکردن. ئەو دۆخە ڕەنج و

هەوڵدانەکانی ئێوەی مایەپووچ دەکردەوە و بەرەو رەوشێکی پەرێشانی دەبردن. لێرە رێگریمان لەمە کرد.

مە:لێرەدا کەوتینە نێو گەڕانێکی مەزندا، دواتر بە گەڕان بە دوای حەقیقەت و رێگای راست گەیشتین. جیهادی راستەقینەمان لە PKK دابینی. لە رابردوودا بەشێکی کەم لەو راستیانەی دەمانزانی، نە دەمانتوانی شی بکەینەوە، نە موخاتەبەکەمان ئێمەی قەبوڵ دەکرد و راستی PKK یان لێک دەدا و دەیانشێواند و هیچ کاتێک نە دەخوازرا باس لەو شەڕەی لە ئارادایە بکەین. بۆ نموونە حەدیسێک هەیە. لە حەدیسەکەدا هاتووە" لەسەرەوەی چەمی فرات لە نێوان رۆماکان و گەلی هەرێمەکەدا شەڕ و پێکدادانێکی سەخت روودەدات و بەشێکی ئەو گەلە 'موجاهید' و بەشێکی دیکەشیان دەبنە بە 'چەتە'".

سەرۆک:... کێ ئەوەی ووتوە؟

مە: سەرۆکی من، ئەوە فەرموودەی پێغەمبەرە. لەو شەڕەدا بەشێکی گەلیش وەکو مەڕ دەمێننەوە و بە بێ زانست لە ناوەراستدا دەمێننەوە. دەبینرێت کە لەو فەرمووودە ئاماژە بە جیهادی PKK لە دژی ستەم دەکات. ئەمەو کاتێک باسمان لەوە دەکرد قەبوڵیان نەدەکرد و کاردانەوەی لێ دەکەوتەوە. بەڵام راستیەکە نیشانیدا جیهای ئەمڕۆ لە کەسایەتی PKK و رێبەرایەتی سەرۆک ئاپۆدا بەرێوە دەچێت.

سەرۆک:... واتا بنەمای ئایینی نوێ و راستیەکانت دۆزیەوە.

مە: بەڵێ سەرۆکی من، لێرە بەم راستییە گەیشتم.

سەرۆک:... لەسەر ئەو بنەمایە دەتوانین بڵێی کە کار و خەباتتان لەسەر خەتێکی راستدا بەرێوە دەچێت. لە مەدرەسەکان و ئەزهەردا هەندێک شتتان دەستەبەر کردووە. بە بڕوام ئێستا بەهێزتر بوون.

ئەوانەی لە ژێر ناوی ئایینەوە هەڵسوکەوت دەکەن، وەکو تورکە چەپڕەوەکان بوون. دەزانرێت کە ئەوانە لە ژێر جلی ئایینەوە چەندە نەژادپەرست و شۆڤەنیستن. لەبەرامبەر بەمانە دەکرێت رۆڵێک بگێڕن و سەرکەوتووبن. لە چوارچێوەیەدا دڵنیام کە لێرەدا هەندێک لە راستیەکانتان بینی. ئیسلام و موجاهید کێیە و چۆنێتی پەیوەست بوونی سیاسەت و ئایینیشتان بینی. بینیتان کە ئەمانەشمان بە یەکانگیر کردنی ولاتپارێزی، ئازادی گەل لەگەڵ پارتی و بینیتان کە چ هێزێکی لێ دەرکەوت. پێموایە لێرەدا ئیرادەتان بەهێزتر بوو، ئیدی لە زۆر گۆڕەپان ئامادەی کار و خەبات ئەنجام بدەی، وایە؟

مە: زۆر ئامادەی سەرۆکی من. لە مەککە و مەدینە یەکەم دامەزراوی ئایینی هەبوو. ئێستا دەبینین کە شوێنی کارکردنی PKK ـەش وەکو یەکەم دامەزراوەی ئایینیەکانە.

سەرۆک:... ئەوەی پێیان دەوترێت مەدرەسە و مزگەوت وەکو ئێرەیە، وایە؟

مە: بەڵی سەرۆکی من.

سەرۆک:... لە سەردەمی دەستپێکی ئیسلامیەتدا، مزگەوتەکان بەمشێوەیە بوون.

مە: بەڵێ وابوو سەرۆکی من.

سەرۆک:... مزگەوتەکانی دیکە ساختەکار بوون.

مە: وایە سەرۆکی من، لەسەردەمی پێغمبەرەکەشماندا مزگەوتی ساختە دامەزرابوو. حەزرەتی محەمەد(د.خ) لەبەرامبەریاندا شەڕێکی دەستپێکرد و مزگەوتەکانی هەڵوەشاندبوویەوە.

سەرۆک:... بەڵێ، لەبەرامبەریاندا تێکۆشانێک بەرێوە چووە. مزگەتی ساختەی وەکو ئەمانە لە نێو گەلدا زۆرن. پێویستە ئەوانیش هەڵوەشێندرێنەوە، وایە؟

مە: بەڵی وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... ئەمە بە شەڕ و بە زمان دەبێت، بەڵام بە هەر جۆرێ پێویستە مزگەوتەکانی ئەو دەوڵەتە فاشیستە وێران بکرێن. وا نییە؟

مە: بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... لە جیاتی ئەوانە[مزگەوتە وێرانکراوەکان] لە شوێنی وەکو ئێرە، پێویستە مزگەوت دروست بکرێت.

مە: ئێرە شوێنی ئیحسانە سەرۆکی من.

سەرۆک:... بەڵێ. ئێرە شوێنی سەردەمی سەعادەتە. شوێنی حەقیقەتە. خۆشحاڵ بن کە مزگەوتێکی بەمجۆرەمان بینی.

مە: مزگەوتی حەقیقەت و خودی حەقیقەتمان لێرە بینی.

سەرۆک:... مزگەوت چییە؟ مزگەوت شوێنی یەکێتییە. ئەوەتا دەیبینن، شوێنی هەرە مەزنی یەکێتی ئێرەیە. ئەو شوێنانەی ئێوە رۆیشتون، مزگەوت نییە، ئەو شوێنانە شوێنی دووڕووێتییە. بەڵام ئێرە شوێنی حەقیقەتە، جێگای شەڕ و تێکۆشانە. وەکو یەکەم مزگەوتەکانی ئیسلامە. بۆ ئەمەش خۆتان زۆر خۆشحاڵ و بە شەرەف بزانن.

مە: خۆمان زۆر بە پۆز دەزانین سەرۆکی من. تا ئێستا پێمان دەووترا ئایین و سیاسەت لە یەکتر جیاوازن. لە جیهاد جیاوازە، واتا دەووترا کە ئایین لە جیهاد جیاوازە.

سەرۆک:... بە تەئکیدەوە ئەمە راست نییە. ئایین بە تەواوەتی جیهادە. بە تەواوەتی ئازادییە. ئەو شتانەی دیکە هەموویان درۆیە. ئەمانەتان بینی و بڕیارەکەتان، بڕیاری ئازادییە.

مە: تا دوا رادە بە بڕیارین سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەتوانی بەڵێن بدەی کە بە بڕیارێکی بەم شێوەیە تا دوایی سەرکەوتوو دەبن؟

مە: بەڵێ سەرۆکی من، دەتوانم ئەو بەڵێنە بدەم.

سەرۆک:... باشە، ئەگەر وابێت تێپەرە. بەڵێ، تۆ وەرە هەڤاڵ. ناوت چییە؟

زا: ناوم (زا) یە. لە ساڵی ١٩٧٢ لە (بی) لە دایک بووم. خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندیم لە هەمان شار تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٩٠ چوومە میسر. خۆم لە زانکۆی ئەزهەر تۆمار کرد.

سەرۆک:... چەند ساڵە لەوێ دەمێنیوە؟

زا: پێنج ساڵە سەرۆکی من.

سەرۆک:... تەواوت کردووە؟

زا: لە قۆناخی کۆتاییدام.

سەرۆک:... باشە.

زا: لە ساڵی ١٩٩٣ لە ڕێگای(ئەب) وە PKK ـەم ناسی. پێشتریش دڵسۆزییەکم هەبوو. بەڵام لەلایەنی فەرمی شتێک نەبوو. هەڵبەت پێشتریش لە سەردەمی خوێندنگای ناوەندیدا پەروەردەی ئایینیم بینیبوو. ئایینیان تەنیا لەلایەنی شکڵەوە فێر دەکردین. بە شێوازێک کە پێکهاتەی سیاسی ئایینیان سانسۆر دەکرد و فێریان دەکردین. لە ساڵی ١٩٩٣ لە زانکۆی ئەزهەر هەندێک دەستمان بە فێربوونی لایەنی سیاسی ئایین کرد. بەڵام ئەو لایەنە سیاسییە هەر چەند هەوڵماندا لە وڵاتی خۆماندا جێبەجێی بکەین، سەرکەوتوو نەبووین. بە هیچ شێوازێک رێ و ڕێبازەکەمان نەدەدۆزیەوە. پاشان لە دوای هاتنمان بۆ ئەکادیمیا، فێربووین کە ئەو لایەنە سیاسییە بە چ شێوەیەک بۆ وڵاتەکەمان سوودی دەبێت. فێری ڕێکخستنکردن بووین. ئێمە لە هەوڵی دامەزراندنی پارتیەکدا بووین، بەڵام ئەو پارتیە بە چ شێوازێک دامەزرێنین، بە راستیش نەماندەزانی. بەو هێزەی لە

ڕێبەرایـــەتی پارتی(عەبـــدوللا ئۆجالان)ـــەوە وەرمـــانگرت، فێـــری شـــێوازی ڕێکخستنکردن و فێری بەکارهێنانی زانستەکەمان بووین لـە پێنـاو سـوود گـەیاندن بە وڵاتەکەمان.

سەرۆک:... واتا ئێرە بوو بە وەڵامێک بۆ هەوڵدانەکانتان.

زا: بەڵی بوو بە وەڵام.

سەرۆک:... ئیدی فێربوون کە ئایین بە شـێوازێکی کاریگـەر و ڕاست لـە پێنـاو ڕزگاری نەتەوەیی گەل بەکاربهێنن.

زا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەرفەتی زیاتر کاریگـەربوون و جێبـەجێ کردنـی زانسـتەکانتان لـە ژیاندا بۆ ڕەخسا.

زا: بەڵێ سەرۆکی من.

سـەرۆک:... وابـزانم ئێسـتا ژیـان هەنـدێک جیـاوازترە، زیـاتر پـەیوەنـدی بـە ڕاستیەکانەوە هەیە، وا نییە؟

زا: بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... وەک ئەوەی کە لە بارێکی قورس ڕزگـارت بـووە. وابـزانم خـاوەن بانگەشەیەکی مەزنی.

زا: بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... بێجگە لەمە بۆ داهـاتوو دەتـەوێ بڵێی چـی؟ لـە چیـدا سـەرکەوتوو دەبی؟

زا: بە ڕاستیش بە قورسـایی بـاری سـەر شـانمان دەزانـین. لەبـەر ئـەوەی کـە ئـەو بـارە، بـاری جـێ گـرتن لـە نێـو شۆڕشـێکدایە و ئـەو شۆڕشـە، شۆڕشـێکە کـە سەرجەم مرۆڤایەتی لەناوخۆیدا دەگرێت. ئەو شۆڕشە لە دژی شـۆڤینیزمی تورکـە کە ئایین وەکو چـەکێک بـەکار دەهێنێت، ئـەو چەکـە لـە دەسـتی ئـەوان دەگرێـت و هێندەی لە دەستمان بێت لە هەوڵی ئەوە دا دەبین کە لە دژی ئەوان بەکاری بهێنین و لەو بڕوایەداین کە ئەنجامی بدەین.

سـەرۆک:... واتـە لـە ڕێ دەرکـەوتنی ئـایین بـە دەسـتی شـۆڤینیزمی عـەرەب، فارس و تورک هەڵدەسەنگێنی و باش دەزانی کە بۆ گەلەکەمان چ ئیفادە دەکات و بە تەئکیدەوە بە هەڵسەنگاندن و شیکارەکانەوە ئەرکەکانمان جێبەجێ دەکەین.

زا: بەڵی سەرۆکی من.

سەرۆک:... واتا دەڵێی کە ئەو بڕیاردارییە لە ئێمەدا گەلێک پێشکەوتووە.

زا: بەڵی سەرۆکی من.

سەرۆک:... لەو بڕوایەدام کە تا دوایی بۆ سەرکەوتنی ئەو ئامانجە هەوڵدەدەن و رەنجتان دەبێ.

زا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... لە دەرەوەی ئەو سەرکەوتنە خۆتان نزیکی هیچ ژیانێکی دیکە نەکەن و بۆ سەرکەوتنی ئەو ژیانە ئەوەی لە دەستتان بێت دەریغی لێ ناکەن.

زا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... بەڵێنەکەت لەسەر ئەو بنەمایەیە، باشە؟ تێپەربە. تۆ وەرە هەڤاڵ.

کە: ناوم (کە). لە ساڵی ١٩٧٣ لە شاری (کا) لە دایک بووم. خوێندنگای سەرەتایی، ناوەندی و ئامادەییم لە هەمان شار تەواو کرد. چوومە زانکۆی ئەزهەر لە قاهیرە. رۆیشتنەکەم بۆ ئەزهەر لەسەر بناخەیەکی راست نەبوو. بەڵام لە دوای گەیشتنم بۆ ئەزهەر هەوڵمدا لەسەر بناخەیەکی راست دروستی بکەم. لە نێو هەوڵدان و گەڕانێکی بەدوای حەقیقەت دا بووم. سەرەتا ئیسلامیەت، ئیسلامیەتی راستەقینەم ناسی. دواتر هەندێک کوردایەتیشم ناسی و لەوێوە لەگەڵ پارتی(PKK) واتە یەکێتی راستەقینەی ئیسلامیەت و کوردایەتی ئاشنا بووم. بە روونی دەڵێم؛ من بە شێوازێکی رەخنەگرانە نزیکی پارتی و رێبەرایەتی پارتی دەبووم. نزیکی شێوازێکی رەخنەی توند و جنێودان ببووم. بەڵام بە تایبەتی لە دوای هاتنم بۆ ئێرە، بینیم کە هەم رێبەرایەتی پارت و رێبازی پارت بە راستیش بۆ موسلمانان و سەرجەم گەلانی دیکە؛ کورد، تورک، فارس و بۆ عەرەبەکانیش رێگای رزگارییە، بە راستیش لەم بوارەدا پێشکەوتنێکی مەزن و بە بڕیارم بینی. بۆ ئەمەش بڕیارمدا. زانیم کە تا ئەمڕۆ هەموو ژیانم لە پێناو هیچدا رۆیشتوە و لە رێ دەرکەوتنێکی مەزن بوو. ژیانی لەمەوبەدوام بە تەواوەتی دەخەمە خزمەتی نەتەوەکەم، هەم رێبازی راستی پارت و خودا. لەم بابەتەدا بەڵێن دەدەم کە سەرجەم فیداکارییەکان و ئەوەی لەدەستم بێت، درێغی نەکەم.

سەرۆک:... بانگەشەکەت مەزنە؟ جیاوای نێوان رابردوو و ئێستات مەزنە؟

کە: سەرۆکی من، دەتوانم بڵێم کە من زیاتر لە نزیکایەتی رێبەرایەتی پارت تێگەیشتووم. بەڵام بە روونی دەیڵێم کە بە تەواوەتی لە نزیکایەتی تەکتیکی رێبەرایەتی پارتی تێنەگەیشتووم...

سەرۆک:... مەبەستت لە ستراتیجی چییە؟

کە: ڕێنماییەکانی ڕێبەرایەتی پارتی و ئەو ڕێنماییانەی بۆ سەرجەم گەلان پێشیخستووە، بە ڕاستیش ڕێنماییەکی دەستەبەر کردنی ڕزگارییە.

سەرۆک:... لە کرداریدا ڕێبازی جێبەجێ کردنێتی.

کە: سەرۆکی من، تەکتیکەکەتان سات بە ساتە. لەلایەنی منەوە هەندێک چاوەڕوان نەکراو بوو. واتە بۆ هەر سات و چرکەیەک خولقاندنێک جێگای باسە. لەبەر ئەوە دەمەوێت لێی تێبگەم و شی بکەمەوە. دەمەوێت زیاتر لێی تێبگەم.

سەرۆک:... بۆ ئەوە دەتەوێت خولێکی دیکەش بمێنیەوە؟

کە: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... با چاوێکی لێبکەین، دەکرێت. ئەمە بۆ هەڤاڵانی دیکەش دەربازدارە. بە کورتی داخوازێکی مەزنت هەیە، ئیرادەت مەزنە، دەتەوێت سەرکەوتنێکی مەزن دەستەبەر بکەی، وانییە؟

کە: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەبێت، بۆ زۆر کار و خەبات ئامادەی وا نییە؟

کە: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... بۆ ژیانی لەمەوبەدوا و پەیوەست بوونت بە پێویستیەکانی ئیسلام دەتوانی بەڵێن بدەی بۆ ڕزگاری نەتەوەیی خەبات بکەی؟

کە: بەڵی سەرۆکی من، دەتوانم بەڵێن بدەم.

سەرۆک:... بەڵێ، فەرموو تێپەر بە. بەڵێ هەڤاڵ ناوت چییە؟

مو: ناوم (مو). لە ساڵی ١٩٦٩ لە دایک بووم. خوێندنگای سەرەتایی، ناوەندی و ئیمام خەتیبم لە شاری ئامەد تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٩١ چووم بۆ زانکۆی ئەزهەر. تا ئێستاش لە ئەزهەر دەخوێنم.

سەرۆک:... ئێستا ڕەوشت چۆنە؟

مو: سەرۆکی من، پێش هاتنم بۆ ئێرە، بڕواکەم لە ئیسلامیەتێکی شکڵیدا دەمایەوە.

سەرۆک:.. ئیسلامیەتێکی تا دوا ڕادە شەکڵی، وا نییە؟

مو: بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... ئەی ئێستا لێرە چۆنە؟

مو: لێرە بە سایەی ڕوناکی هەڵسەنگاندن و شیکارەکانتان، لەسەرەوەی هەموویان بە ناسنامەی خۆم گەیشتم. بە تەواوەتیش نەبێت، گەیشتم بە ئاستێکی

زانابوونی کۆمینالی، مرۆڤایەتی و حەزکردنی نیشتمانی. بەو بڕوایە گەیشتم کە بیر و باوەریەکان، برایەتی نەژادەکان نابنە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم ژیانێکی ئازاد. لە پیرۆزی تێکۆشانی میزۆبۆتامیایەکی ئازاد تێگەیشتم. لەو پێناوەدا ئامادەم بۆ جێبەجێ کردنی هەر ئەرکێک لەسەر شانم بێت، سەرۆکی من.

سەرۆک:... وا دیارە ئەو مژارانەی دەستنیشانمانکردوە، خاڵی گرنگن. بە تەئکیدەوە ئایین کۆسپ و تەگەرە نییە لەبەردەم رزگاری گەلان، یەکسانی، یەکێتی و ئازادی. بە پێچەوانەوە، بە شێوازێکی هەرە دڵسۆز، راستگۆیانە و شکڵێکی هەرە راست ئەوانەی دەوێت. ئایین لە میزۆپۆتامیا هێندەی ماف، یەکسانی، ئازادی و مێژوو دێرینە. لەو روانگەیەوە خۆتان بە شێوازێکی پیرۆز بەخشین و لەگەڵ ئەو رۆحە باڵایە، روناکییەکی مەزنی پێویستە و بۆ هێنانە سەر رێگای راستی ئەو ناکۆکیانەی ئێوە تا ئێستا رووبەرویان بوون، بۆ ئێوە لەم خاڵەدا رێگا لەبەردەم پێشکەوتنی مەزن و بەرچاو دەکاتەوە. لەبەر ئەمەش ئەو سەرەتایەی لێرە دەستتان پێکردووە، وە دەکات لەمەوبەدوا ژیان زۆر جیاوازتر و گەلێک بە سەرکەوتوویی تێپەر بێت. وا نییە؟

مو: بەڵێ سەرۆکی من. لە رابردوودا دوژمن خۆی خستبوو ناو فیکر و مێشکمانەوە. بەڵێن دەدەم بەو تەکتیکانەی لێرەدا فێریان بووین، هیچ کاتێک هەڵنەخەڵەتێم سەرۆکی من.

سەرۆک:... بە تەئکیدەوە، ئەوە زۆر گرنگە. واتا ئەگەر ئایین، ئیسلام و ئایدیۆلۆژی بەو رێبازە راستە لە ناخی ژیاندا جێبەجێ بکەن، هەروەها ئەگەر خاوەن بانگەشەیەکی مەزن بن و هەوڵدان و رەنجێکی مەزن پێشکەش بکەن، بە تەئکیدەوە ژیان بۆ ئێوە رووداوێکی مەزنە و هەر ڕۆژ دەبێت بە تێکۆشانێکی مەزن. تێکۆشان دەبێتە هۆی پێشکەوتنتان. ئیدی دەبێت رێ و رێبازی تێکۆشان فێر ببن و دەستەبەری بکەن. پێویستە رێ و رێبازی پارتیمان دەستەبەر بکەن و فێری ببن. دەبێت رێباز و شێوازی پڕۆپاگەندە فێر ببن. ئەمانە یەکێک لە باشترین کار و خەباتەکانن کە ئیسلام بە سەدان ساڵە بەرێوەی دەبات و پەیڕەوی دەکات. ئەگەر تا ئێستا ئەوانەمان بە شکڵ و شێوازێکی راست ئەنجام بدایە، ئەمڕۆ لە پێشەوەی عەرەب، عەجەم و تورکەکان دەبووین. لەبەر ئەوەی ئیسلامیەتمان بە شێوەیەکی راست جێبەجێ نەکرد، بە راستیەکانمانەوە جێبەجێمان نەکرد، لە دۆخی هەرە بێ هێزدا ماینەوە. ئەو دۆخە لێرە سەرەراست دەکەین.

مو: بەڵام لە کەسایەتی خۆمدا بینیم کە ئەمە بەش ناکات. لەو بڕوایەدام ئەگەر چانسێکی دیکەم پێ ببەخشرێت،باشتر ئەو دۆخە هەڵدەسەنگێنم و شی دەکەمەوە.

سەرۆک:... چانسێکی دووەمی چۆن؟

مو: چانسی مانەوەم لە خولێکی دیکەدا.

سەرۆک:... تۆش داوای چانسێکی دیکە دەکەی؟

مو: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک: (کە) ەش داوای چانسێکی دیکەی کردبوو. لەسەری دەفکرین. واتا دەتەوێت لەسەری قاڵ بیتەوە.

مو: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەبێت. دەکرێت چانسێک بدرێت بە یەک یا دوو هەڤاڵ، بە گوێرەی ئەوەی کە لەگەڵ هەڤاڵانی دیکەش لە نێو کۆردینەیەک دا دەبن، دەکرێت لەسەر چانسێکی بەمجۆرە بفکرین. بەڵام ئێستا ئامادەن بۆ دەستپێکردنی سەرەتایەکی پتەو و سەلامەت سوێندی بڕیارداری بخۆن؟

مو: ئامادەم سەرۆکی من.

سەرۆک:... بەڵێ، فەرموو دابنیشە. بەڵی هەڤاڵ ناوی تۆ چییە؟

ئائی: ناوم (ئا.ئی) لە ساڵی ١٩٧١ لە دێرسیم لە دایک بووم.

سەرۆک:... کوێی دێرسیم؟

ئا.ئی: پەرتەک.

سەرۆک:... لە کوێ؟ لە نەریتی سوننەکان وایە؟

ئا.ئی: نا سەرۆکی من.

سەرۆک:... چۆن شتی وا دەبێت؟

ئا.ئی: منیش نازانم.

سەرۆک:... ئەوان هیچ شتێکی وا نافکرن، چۆن بوو تۆ هزرێکی بەمجۆرەت کرد؟

ئا.ئی: بە گوێرەی هێز و توانای خوم...

سەرۆک:... چۆن ئەوە فکری، کێ بە تۆی ووت؟ لەوانەیە کەوتبیتە ژێر کاریگەریانەوە.

ئا.ئی: لە دوای تەواو کردنی خوێندنگای ناوەندی...

سەرۆک:... لە کوێ؟

ئا.ئی: لە دێرسیم.
سەرۆک:... لە ناوەندی شار یاخود لە ناوچەی پەرتەک؟
ئا.ئی: لەبەر هەندێک تاوان دادگاییم هەبوو.
سەرۆک:... چ تاوانێک؟
ئا.ئی: بە هۆی پەیوەندیم لەگەڵ مامۆستا...
سەرۆک:... شەڕکەر بووی؟
ئا.ئی: تۆزێک.
سەرۆک:... جیاواز؟
ئا.ئی: لەبەر ئەو هۆکارە لە خوێندنگای ئیمام خەتیب دەستم پێکرد. خوێندنم لە ئیمام خەتیب تەواو کرد. لەبەر ئەوەی نەمتوانی زانکۆ قازانج بکەم، لە ساڵی ١٩٩١ چوومە ئەزهەر.
سەرۆک:... کێ ئەو هەڤاڵە دەناسێت، دەبێت چۆن دەستی بە خوێندنی ئایین کردبێت؟
خا: سەرۆکی من، من ئەو هەڤاڵە لە ئیمام خەتیب لە شاری ئامەد دەناسم. ئەو کاتە وەکو عەلەوییەک بەردەوام تەنیا بوو.
سەرۆک:...بە راستیش لە رەوشێکی زۆر و زەحمەت دا تێپەری خوێندنگای ئیمام خەتیب بووە؟ لەبەر ئەوەی ئەو رەوشە، رەوشێکی جیاواز و هەلاوێژە. هۆکاری ئەو کارە چ بوو؟
خا: سەرجەم خانەوادەکەیان ئایینیان گۆڕی سەرۆکی من.
سەرۆک:... بە راستیش ئایینیان گۆڕیوە؟
خا: بەڵێ سەرۆکی من، ئایینیان گۆڕی.
سەرۆک:... چ کاتێک؟
خا: نزیکەی ٥٠ ساڵێک دەبێت سەرۆکی من.
سەرۆک:... بەمجۆرەیە هەڤاڵ؟
ئا.ئی: بەڵێ سەرۆکی من.
سەرۆک:... خۆت بگۆڕە، کێشە نابێت. عەلەویتی و سوننە، ئێستا هەر دووکیان یەکانگیر دەکەی و دەبێ بە ئایینێکی نوێ. وایە؟
ئا.ئی: بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە.
سەرۆک:... ئایینێکی نوێ. ئایینی PKK. بە واتەیەکی دیکە، "سەنتەز"ی راستەقینەی ئایینەکان. تۆش ئەمە وەکو پێهەڵگرتنێک دەبینی؟

ئا.ئی: بەڵی سەرۆکی من.

سەرۆک:... ئێستا ئارام و ئاسودەی؟

ئا.ئی: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەتەوێ زۆر کار و خەبات ئەنجام بدەی؟

ئا.ئی: بەڵێ دەمەوێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... ئەگەر خاوەنی کەسایەتێکی سەرهەڵدێری و کاردانەوەت دەبێت، پێویستە کار بکەی.

ئا.ئی: بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... بێجگە لەمە چۆن هەست بە خۆت دەکەی؟ ئیسلام راستیەکان دەڵێت. بیڵێ!

ئا.ئی: تا دوا رادە باشم سەرۆکی من.

سەرۆک:... باشی، کار و خەبات دەکەی؟

ئا.ئی: بەردەوام دەبم لە هەوڵدانەکانمدا سەرۆکی من.

سەرۆک:... بیر و بڕوات سەبارەت بە سەرکەوتنت چۆنە؟

ئا.ئی: هیوا و بیر و بڕوام هەیە سەرۆکی من.

سەرۆک:... دەتوانی سوێندی بڕیارداری بخۆی؟

ئا.ئی: بەڵی دەتوانم سوێند بخۆم سەرۆکی من.

سەرۆک:... باشە، دانیشە. فەرموو هەڤاڵ، ناوی تۆ چییە؟

سا: ناوم (سا). لە ساڵی ١٩٧٤ لە دایکبووم. بۆ ماوەی ١٢ ساڵ لە دیمەشق خوێندم. لە ساڵی ١٩٩١ چوومە میسر. لە میسرەوە هاتم بۆ ئەکادیمیا. لەم ئەکادیمیایەدا راستی خۆم بینی و فێری حەقیقەتی ئیسلام بووم و لێی تێگەیشتم.

سەرۆک:... بە راستیش لە حەقیقەتی ئیسلام تێگەیشتی؟

سا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... بینیت کە ئیسلامیەت و تێکۆشان چۆن بە یەکەوە گرێدراون؟ لە بنەڕەتدا بەدوای ئەو راستیەدا بوون. لەمەوبەدوا دەتوانی بەهێز ریپێوان بکەی و دەتوانی ئیسلامیەت لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی گەلدا بەرێوە ببەی؟

سا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... بڕوات بەخۆت هەیە؟ بەهێز بووی؟ جیاوازی لە نێوان سەرەتای هاتنت بۆ ئەکادیمیا و ئێستادا هەیە؟

سا: سەرۆکی من، ماوەی مانگێکە لەو ئەکادیمیایە دەمێنمەوە. بە تەواوەتی گۆڕانکاریم لەخۆمدا دروست نەکردووە و خۆم وەرنەچەرخاندووە...

سەرۆک:... بەڵام ڕێباز و بناخەکەی فێر بووی. سەرە داوەکەت گرتووە. دەتوانی تا دوایی بڕۆی؟

سا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... جیا لەمە دەتەوێت شتێک بڵێی؟

سا: بەو هێزەی لە ڕێبەرایەتیم وەرگرتووە، بەردەوام دەبم لە ڕێپێوانەکەم.

سەرۆک:... دەڵێی بە هێزی ڕێبەرایەتی و PKK قسەو کردار و ژیانت لە پێناو گەلی کورد و ئیسلامی راستەقینەدا دەبێت، وا نییە؟

سا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... باشە، دانیشە. فەرموو هەڤاڵ، ناوی تۆ چییە؟

شۆ: ناوم (شۆ) لە ساڵی ١٩٧١ لە دایک بووم. خوێندنگای سەرەتاییم لە شاری ئامەد دەستپێکرد. خوێندنگای ئیمام خەتیبم لە ئامەد تەواو کرد. لە ساڵی ١٩٩١ بۆ خوێندنی زانکۆ چوومە ئەزهەر. لە ساڵی ١٩٩٥ لە ڕێگای (ئاب) ـەوە ئاشناییم لەگەڵ بزوتنەوەی ئیسلامیدا پەیدا کرد. لەو چوارچێوەیەدا بەشداری پارتی(PKK) بووم و ئێستا لێرەم. ئەو پارتی و سەرۆک ئاپۆیەی لە مێشکم دابوو، ئێستا زۆر گۆڕانکاری پێوە دیارە. ئەو PKK و ڕێبەرایەتیەی کە بە شێوازی تیۆریک دەمزانی، جیاوازیەکی زۆری لەگەڵ پارتی و ڕێبەرایەتی ئێستا لە ئێرە هەیە.

سەرۆک:... تایبەتمەندی هەرە بەرچاو چییە؟

شۆ: تایبەتمەندی هەرە بەرچاو، گواستنەوەی زانیارییە تیۆریەکانتانە بۆ هەڤالان، هەروەها بە سەرنجێکی مەزنەوە ئەو زانیاریانە نیشان دەدەن. ئەمە بە شێوازێکی دەگمەن لە ڕێبەرەکانی دیکەدا دەبینین.

سەرۆک: جیاواز؟

شۆ: دەتوانم بڵێم سەبارەت بە ئیسلامی سیاسی لێرە فێربووم.

سەرۆک:... ئیسلامیەتی سیاسی و شۆڕشگێری. جیاواز؟

شۆ: ئێمە پێشتر خاوەنی چەمکی پێچەوانە بووین.

سەرۆک:... ئەوانە تێپەڕ کران؟

شۆ: بۆ تێپەڕاندنی هەوڵ دەدەین.

سەرۆک:.. وەک دەڵێن نوێ بوونەوە بەرفراوانە. سەرەتایەکی نوێ بۆ ژیان پێکهات. بە تایبەتیش فێربوون کە زانیارییگەلێکی وشک بە چ شێوازێک بخەنە ژێر فەرمانی گەلان و مرۆڤایەتیەوە. لەو مژارەدا وەکو ئاگادارن کە ڕێبەرایەتی ڕێگای هەرە کاریگەری وەرچەرخێنەری تیۆرییە بۆ کردار. کەم تا زۆر پیشانماندا کە ئەم هەموو دۆگمایەی خۆرهەڵاتی ناوین بە تایبەتیش فیکری ئایینی بە چ شێوازێک بە ڕاستی گەلانەوە وابەستە دەکرێت. بە تایبەتیش بەرامبەر بە چەواشەکردن و لاڕێکردنی ئایین لە تورکیا، ڕاستی ئایینمان ئاشکرا کرد. وابزانم ئەمەش جۆش و خرۆشتان پێ دەبەخشێت.

شۆ: بەڵێ وایە سەرۆکی من، جۆش و خرۆش دەبەخشێت.

سەرۆک:... پێموایە ژیانی لەمەوبەدوا زۆر جیاواز دەبێت. دیارە دەتانەوێت زۆر سەرکەوتوو بن.

شۆ: بە تەئکیدەوە وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:... ئێوەش بۆ لەمەوبەدوا، دەتوانن بەڵێنی بەردەوامی ڕێپێوان تا سەرکەوتن بدەن؟

شۆ: بە یارمەتی و هاوکاری ئێوە، ئەمە ئەنجام دەدەین سەرۆک.

سەرۆک: باشە، ناوی ئێوە چییە هەڤاڵ؟

ئا: نازناوم(ئا) یە. لە ساڵی ١٩٧١ لە (ئان) لە دایکبووم. خوێندنگای سەرەتایی، ناوەندی و ئامادەییم لە هەمان شار لە ئیمام خەتیب تەواو کرد. لە کۆتاییدا لە مەدرەسەیەکی ئەستەنبوڵ بەردەوام بووم لە خوێندندا.

سەرۆک:... لە کام مەدرەسە؟

ئا: لە مەدرەسەی مەحمود ئەفەلەر. دواتر بۆ بەردەوامی خوێندن لە مەدرەسە بەرەو میسر بەرێکەوتم.

سەرۆک:... چەند ساڵە؟

ئا: چوار ساڵە.

سەرۆک:... باشە، واتەی ئەو ئەکادیمیایە بۆ ئێوە چییە؟

ئا: لە قۆناخی خوێندنمدا، لە نێو فیکر و جەماعەتی جیاوازدا ماندوو بووم. هەر وەکو ئێوەش ئاماژەتان پێکرد، لە تورکیا پێکهاتەیەکی ئیسلامی دۆگما پێشکەشمان کرابوو. بەڵام لە ئەزهەر ئاشنای جیهان شمول بووم و تێگەیشتم کە ئەم سدستەمسنری فیکر ئدسلام نین. هەڵبەت بە گوێرەی خوێندنەوە و توانای

وەرگرتنمـــان، ئەمانـــەمان وەرگرتـــوە. لەبـــەر ئـــەوەی کـــە هـــەر چەنـــدە زانســـتە ئیسلامییەکان لەلای ئێمە بێت، بەڵام هێشتا ئەو ژیانە نارەسـەنەی کۆمـاری تورکیـا پێی داوین، تێپەڕمـان نـەکردووە. وەکو کەسـایەتی دەمـەوێت ئەمـە بڵێم. هۆکـاری بەشداری کردنم لـە پـارت و هـەرە دوایـی ئامـانجی هـاتنم بۆ ئـەو ئەکادیمیایـە، بـە هاوکـاری و یارمـــەتی ڕێبەرایـــەتی و لـــە ســـایەی هـــەڤـاڵانی ئامـــادە تێپـــەڕانـــدنی پاشڤەڕۆیەتی کەسایەتیمانە. لەو بڕوایەدام کە ئەوانەم تێپەڕاندووە. بەو هێزەی کـە ڕێبەرایەتی پێی بەخشیوم، بۆ ڕێپێوانێکی بە بڕیار ئامادەم.

سـەرۆک:... ئەکادیمیا وەڵامدەرەوەی گەڕان و هەوڵدانە بناخەییەکانت بوو؟

ئا. سـەرۆکی من، ئێمە پێشتریش لە هـەڵسـەنگاندن و شیکردنەوەکانی خۆمانـدا لەو بڕوایەدا بووین کـە ئیسـلام ڕێبـەرێکی سیاسییە، بـەڵام لـە ژیانی ئێسـتامدا، لـە دۆخی ئێستادا نازانم بە دوای کام لێگـەڕیندا بڕۆم و بـەرەو قوڵایی کـام ڕەوت دا بگەڕێم.

سـەرۆک:... ئێستا لە خەتە گشتیەکاندا بناخەی سـەبرت وەرگرتووە.

ئا: سـەرۆکی من، بەشداری کـردنم لـە پـارت، بڕیـارێکی زۆر و زەحمـەت بـوو، چونکـە ئـەوەی بـۆ ئێمــە باسـکراوە و پێشکەشـمان کـراوە ئایـدیۆلۆژیای ئـاینی ئیسلامییە. لای ئێمەی موسلمان نـاو زۆر گرنگـە. شـتێکا بـەمجۆرا لـە نـاوی پارتـدا بوونی نییە. لە شـیکردنەوەکانی ڕێبەرایـەتی تێگـەیشـتین کـە ئـەم دۆزە لـە نـاواخنی پارتدایە....

سـەرۆک:... ئەوەی ئێمە هەڵسـەنگاندنێکی بـە بانگەشـەیە بۆ ئیسـلام، ڕێبـازێکی زۆر شۆڕشگێرانەیە. چەمکێکە زیاتر گرنگی بـە گەوهـەری ئیسـلام دەدات. لێرەدا ئەوە زۆر پێویستە. واتە ئەوە شێوازێکی ژیانە پێشکەش بە ئێوەی خـاوەن هـەوڵی مانادار کراوە کە تا ئێستا ژیانی بـە فیـڕۆ چوبـوو. چونکـە ئـەوە ژیـان نییـە. ئەگـەر ئێوە ئەو گـەڕان و بەدواداچوونـەتان لەسـەر بنـەمای شۆڕشـگێری و هـەڵوێسـتێکی سیاسی یەکانگیر و یەکگرتوو ئەنجام بدەن، لەو بڕوایـەدام کـە پەرەسـەندنی مـەزن بەدەست دێنن و تەنانەت دەتوانن ڕێبەرایەتیش بکەن. لەو مژارەدا تا دوایی متمانـە و بڕواتـان بـە خۆتـان هـەبێت. لـەو بوارەدا خۆتـان بـاش پـەروەردەو بـە دیسـیپلین کردووە، بەڵام لایەنە ناتەواوەکەی نزیکایەتی شۆڕشگێری سیاسی بوو. نزیکایەتی تـەکتیکی بـوو. بنـەماکانی ئەوانەشـتان لێـرە لـە PKK دا بینـی. پێویسـتە قـووڵی بکەنـەوە. ئـەو هەوڵدانانـەتان لەمەوبـەدوا بـە تایبـەت بـۆ پێکهێنانیـان لـە بـواری ژیانیەوە، ئیسلام زیاتر روون دەکاتەوە. بەڵێ ئیتر تیۆری ئیسـلام دەخەنـە بـواری

کرداریەوەو دەیکەن بە ڕێبازی ڕزگاری شۆڕشگێری. هەروەها پێویستە شێوازی پروپاگەندەگەی دەستەبەر بکەن.

لە تورکیا گەلێک کەسی ئیسلامی هەیە، دەزانین کە ئەوانیش چەند سەر لێ شێواو و شلەژاون. بۆ ئەوانیش هەوڵ دەدەین ڕێگایەکی دەرکەوتن و ڕزگاری لەو سەر لێ شێواویە دابین بکەین و بناخەیەک دروست بکەین. ئەگەر پێویستیتان بەو کارە هەبێت، ئەوەی لێرەدا فێری بوون، بەو هێزەی لە ئێمەتان وەرگرتووە، تا دوا ڕادە ئامادەی بکەن و پێشکەشی بکەن. لەو پێناوەدا دەکرێت ئامرازەکانی پڕوپاگەندەو ئایدیۆلۆژیش بەکار بهێنن. ڕۆژنامە هەیە، تەلەفزیۆن و ڕادیۆ هەیە، لە کاتی پێویست دەتوانن سوود لەوانەش وەربگرن. پێویستە پێکهاتەی ئەو ئیسلامە ساختەیە تێکبشکێنن و لەجیاتی ئەو ڕێبازی ڕاست و شۆڕشگێری فەرز بکرێت و ئەمەش بە بڕوای من پێشکەوتنێکی مەزنی شۆڕشگێرییە. بەو ڕادەیەی نوێکردنەوەی ئیسلام و سەراوبنکردنی ساختەکاریەکانە، پێشکەشکردنی هێزە سەرجڕاکێشەکەی ڕاستیەکانە بە گەلان، لەم ئەرکەدا سەرکەوتوو بن، ئەوا چەندە بەختەوەر دەبن. وابزانم ئەمە جۆش و خرۆشێکی مەزنتان پێ دەبەخشێت، وا نییە؟

ئا: سەرۆکی من، دەمەوێت ئەوە بڵێم؛ لە مێژووی کوردستاندا تا ئێستا شۆڕشێکی هێندە مەزن سەریهەڵنەداوە. بزاڤەکانی پێشتری مەلا، شێخ و ئاغاکان ناکەوێتە چوارچێوە و پێگەی شۆڕشەوە. ئەوان بۆ بەرژەوەندی تاکەکەسی خۆیان ئەوەیان ئەنجامدابوو. لەبەر ئەوەی کوردستان بۆ شۆڕشێکی لەمجۆرە شایەتحاڵی کردوە، لە مێژووی جیهاندا شوێنی خۆی گرتووە...

سەرۆک:... بەڵێ، نەک تەنیا بۆ ئیسلام، ئەگەر بۆ گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوینیش هەندێکی دیکە ئەو بناخەیە بەرفراوانتر بکەین، ڕێپێوانێکی سەرکەوتوو ئەنجام بدەین، ئەوە هەم ڕێک دەبێت لەگەڵ جەوهەری شۆڕشەکەمان، هەم گەلێک شتی دیکە هەیە کە دەتوانرێت ببەخشرێت و ئەوەش جۆش و خرۆش دروست دەکات. ئیدی بۆ ئەمەش پێویستە لە قاڵبوونەوەیەکی مەزندا بن. بە یەکگرتنی زانستە بەرفراوانەکانی ئیسلام و ئاراستەی سیاسی ـ شۆڕشگێری ئێمە، سەرەتا لە ڕاستی میزۆبۆتامیادا جێبەجێی بکەن و بەرەو قەڵەمبازێکی مەزن هەنگاو بنێن. ئەمە بانگەشە و کار و خەباتێکی مەزنی پێویستە و دەبێت سەکەوتوو بن. تا دوا ڕادەش لە دۆخێکی بە بڕیاردا لەسەر ئەو بنەمایەدا ئامادەی سوێند بخۆی؟.

ئا. بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... باشە، فەرموو دانیشە. فەرموو هەڤاڵ ناوی ئێوە چییە؟

شا: ناوم (شا) لە شاری (تە) لەدایکبووم. خوێندنگای سەرەتاییم لە هەمان شار تەواو کرد. پاشان لە ڕێگای کوڕە پورم چوومە دیمەشق. لە دیمەشق لە ئەنستیتۆی ئایینی خوێندم. لە دیمەشق پەیوەندیەکانم لەگەڵ لایەنە ولاتپارێزەکان بوو. عەرەبەکانی دیمەشق لە بواری ئاییندا مافی ژیانیان بە کورد نەدەدا.

سەرۆک:... مومکین نییە ئەو مافە بە کوردان بدەن و پەسەندی بکەن. هەر کەس دەیەوێت بۆخۆی دەستی بەسەردا بگرێت و بیکاتەماڵی خۆی. بەڵێ.

شا: پاشان چوومە میسر. لەوێش لە ئاییندا هیچ شتێکم نەدۆزیەوە، تا ئەو کاتەی هاتم بۆ ئێرە. لێرە، لەو ئەکادیمیایەدا ئایینی ڕاستەقینەم دۆزیوە.

سەرۆک:... ئایین و نەتەوە. ئایین و ولاتپارێزی. ئایین و تێکۆشان. ئایین و ئازادی. ئایین و مرۆڤایەتی. بینیتان کە هەموویان بە چ شێوازێک بەیەکەوە گرێدراون و پەیوەندییان لەگەڵ یەکترەوە هەیە و لە زۆر لایەنەوە روون بوونهتەوە.

شا:بەڵێ وایە سەرۆکی من.

سەرۆک:...بە تەواوەتی متمانە و بڕوات بەخۆت هەیە؟

شا: بەڵێ سەرۆکی من، تەوام متمانەم بە خۆم هەیە.

سەرۆک:... پێویستە لەو ئایینە ڕاستەقینەیەدا ئەنجامی مەزن دەستەبەر بکەن و جێگای خۆت لەناو تێکۆشاندا بگری. جیاوازتر، دەتوانی لەگەڵماندا بەردەوام بی؟

شا: بەڵی سەرۆکی من، دەتوانم بەردەوام بم لەگەڵتاندا.

سەرۆک:... دەتوانی جێگایەک لەناو شۆڕشی PKK دا بگری؟.

شا: بەڵی سەرۆکی من، دەتوانم.

سەرۆک:... بە بڕیاری؟

شا: بەڵێ سەرۆکی من، بە بڕیارم.

سەرۆک:... ئیرادەی تەواوت هەیە؟

شا: بەڵێ سەرۆکی من.

سەرۆک:... لەو چوارچێوەیەدا دەتوانی بەڵێنی بڕیارداری بدەی؟

شا: بەڵێ سەرۆکی من، دەتوانم بەڵێن بدەم.

سەرۆک:... باشە، فەرموو دابنیشە.

سەرۆک:... بەڵێ، ئەو گرووپەشمان بەڵێنێکی بە بڕیاریداوە. لەمە بەدواوە پێویستە لە نوێنەرایەتی کردنی ئاییینی ڕاستەقینە ئاگادار بن و لەسەر ئەو بنەمایەش لە کار و خەباتەکانتاندا سەرکەوتن دەخوازم.

سەرۆکایەتی پارتی
پێنجی تشرینی یەکەمی ١٩٩٥

# "حزبوڵا" تەکتیکی نوێی شەڕی تایبەت
# ئەرکەکانمان لە بەرامبەریدا

پێویستە چەند بابەتێکی دیکەش روون بکرێنەوە. دەکرێ سەبارەت بە بابەتی جۆراوجۆر رێنمایی روون و باشتر دەستەبەر بکەین. یەکێک لەوانەش گرووپێکە کە ناوی "حزبوڵا" بەکار دێنێت و هەر کە دەچێت رووی راستەقینەی ئاشکرا دەبێت و ناوەڕۆکەکەی روونتر دەبێتەوە. تاخمێکە بەشێوەیەکی هەرە هۆڤ و نامەردانە مرۆڤە وڵاتپارێزەکانمان لە پشتەوە گوللەباران دەکات، ئەمانە زۆر مەترسیدار و دواکەوتوون، گوایە بانگەشەی ئەوە دەکات کە بە "ناوی خوا" شەڕ دەکات! لەبەر ئەو هۆکارەش دەمانەوێت راوەستە لەسەر تەکتیکی نوێی هێرشی پاشڤەڕوویی و دواکەوتوویی بکەین کە لە کوردستان لە ژێر ناوی حزبوڵا دەستی بە کار کردووە، لەبەرامبەر ئەمانەش ئاماژە بە ئەرکەکانی سەر شانمان بکەین.

ئەگەر چاوێک بە مێژوودا بخشێنینەوە، دەکرێت بە روونی ببینرێت کە لەبەرامبەر پەرەسەندنی نەتەوەیی گەلی کورد بەردەوام لە ژێر ناوی ئیسلامیەت هێرشی کراوەتە سەر و رووبەروی چەندین کۆمەڵکوژی بۆتەوە. هەر چەندە ئیسلامیەت لە سەردەمی دروست بوونی و بەگوێرەی جەوهەرەکەی دوژمنایەتیەکی تایبەتیشی بەرامبەر بە گەلان نەبووبێ، بەڵام وەک دەزانرێت لە سەردەمی سەڵتەنەتی ئەمەویەکان و لە دوای ئەویشدا رژێمەکانی وەکو عەباسیەکان- کە لە ناو ئەوانەدا سەلجوقییەکان و عوسمانییەکانیش بوونیان هەیە- بە تەواوەتی لەمیانی لایەنی راستڕەویەوە ئیسلامیەتیان لە جەوهەری شۆڕشگێری خۆی دوور خستۆتەوە و کردوویانە بە ئامرازێکی هێرشکردن و حوکمڕانی ئیمپریالیستی.

ئەمەویەکان کە سەڵتەنەتێکی دەرەبەگایەتی رەهان، لەمیانی بەکارهێنانی ئیسلامەوە ویستویانە گەلان دەستەمۆ بکەن، دەسەڵاتی خۆیان بەسەر کولتوور و پەرەسەندنی نەتەوەییدا بسەپێنن، ئەمەش تا ئاستی ئاسمیلەکردنی (تواندنەوەی)

ئەو گەلانە رۆیشتووە. سەرەرای ئەوەی حەزرەتی محەمەد(د.خ) فەرموویەتی کە هیچ جیاوازییەک لە نێوان گەلی عەرەب و گەلانی دیکەدا نییە، بەلام ئەمەویەکان بە روونی و ئاشکرایی جیاوازی پیشدەخەن و عەرەبەکان بالاو دەسەلاتدار دەکەن. بێجگە لەوەی لە سەردەمی سەڵتەنەتەکەیان چوارچێوەیەکی دیاری دەسەلات بەعەرەبەکان دەدەن، هەندێک جار خۆشیان شکۆدار و بالا دەکەن. مامەڵەی کۆیلە لەبەرامبەر بە گەلانی دیکە دەکەن و هەر کە دەچێت پێگەی گەلانی دیکە لە پلەی دووەم و سێیەم مسۆگەرتر دەبێت. ئەو رەوشە لەسەرجەم رژێمەکانی سەڵتەنەتی دواتریش بەردەوام دەبێت. بەمجۆرە دەیانەوێت ئیسلامیەت وەکو رووپۆش و دەمامکێک بۆ پێشخستنی نایەکسانی لە نێوان نەتەوەکان، بە واتایەکی راستتر بۆ پێشخستنی نایەکسانی لە نێوان میللەتەکان تەنانەت بۆ داگیرکردن بەکار بهێنن. دواتر بەشێوەیەکی روون و ئاشکراتر دەبینین کە ئیسلامیەت لە دەستی دەسەلاتی عەرەبەکاندا رۆڵی ئامرازێکی شۆڤینیزم دەبینێت. لەژێر ناوی ئیسلامیەت هەر کەس لاسایی دەسەلاتی عەرەبەکان دەکەنەوە. دەیانەوێت بە بەکارهێنانی ئیسلامیەت ملکەچی و خزمەتکردن بۆ دەسەلاتی عەرەبی بچەسپێنن، راستی و ڕەوایەتی بەو دەسەلاتە ببەخشن. لەو چوارچێویەدا هەرکەس بە تایبەتیش هێزە فیودالەکان لەدەوروبەری ئەو دەسەلاتەدا دەکەونە نێو ڕکابەریەکەوە. لە بواری هەڵگرتنی ناوی عەرەبیەوە بگرە تا دەگاتە چۆنیەتی گەڕاندنەوەی بنەچەکەیان بۆ بنەچەی پێغەمبەر دەکەونە نێو ڕکابەریەکەوە. بەمجۆرە بەرژەوەندیەکانی فیودالی و بەکرێگیراوێتی تا رادەیەکی زۆر دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی لەبەر دەکات. هەڵبەتە بەمجۆرە گەلانیش لە پەرەسەندنی میللییاندا بە ئەندازەی رووبەروبونەوەی فشار و سەرکوتکردن، تووشی ئاسمیلاسیۆنیش دەبنەوە.

کاتێک تورکەکان پێشەنگایەتی ئیسلامیەت دەگرنە دەست، ئەو ڕەوتە خراپ و نەرێنیە خێراتر دەبێت. دواتر سەلجوقیەکان دەسەلاتیان گرتە دەست، لەمیانی ئەو شێوازەی پەلهاوێشتنی ئیسلامی کە لە عەباسیەکانەوە وەریانگرتبوو بەرەو ناوەوەی ئەنادۆڵ پێشکەوت، فشار و ئاسمیلاسیۆنی سەر گەلان خێرایی زیاتری بەخۆیەوە بینی.

وەک ئاگادارین کە ژمارەیەکی زۆر لە گەلانی ئەنادۆڵ یان لە رێگای شمشێرەوە یان لە رێگای ئاسیمیلاسیۆنەوە دووچاری گۆڕانکاری هاتن و ئەو رەوشە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. تا ئێستاش پاشماوەی گەلان لە بە تورک

کردن و بە ئیسلام کردن رزگاریان نەبووە. تەنانەت لە شەڕ و پێکدادانەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان لە بۆسنا- هەرسەک یش ئەو هەڵوێستە بە کاریگەرە، واتە هەڵوێستی بە زۆر بە موسلمان کردن کاریگەرە. ئەو واقیعە ئیمپریالیستی، داگیرکاری و ئاسمیلاسیۆنیستە لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا ریگا لەبەردەم شەڕ و پێکدادان دەکاتەوە.

ئیسلامیەت لەژێر دەستی ئیمپراتۆریەتی ئێرانیشدا، لە ژێر جیلوە و خشڵێکی جیاوازتری مەزهەبیدا هەمان رۆڵی گێڕاوە. خۆی لە خۆیدا مەزهەبی شیعە هەڵگری هێلی نەتەوەپەرستی ئێرانە. مەزهەبی شیعە بەرهەمێکی کاردانەوەی ئیسلامیەتە لەبەرامبەر بە شۆڤینیزمی عەرەبی ئەمەوی و عەباسیەکان و زیاتر خۆجێی بووە و تەنانەت بە ئاستی میللی بوون گەیشتووە. زیاتر شیعەیەتی، تا رادەیەکیش عەلەویتی ئەمڕۆش هێشتا تا ئاستێک لە نێو کوردانددا هەیە. ئێرانیەکان تا رادەیەک بەمجۆرە رووخساری خۆیان گۆڕیوە، تا ئاستێکیش لەمیانی ئەو موسلمانێتیەی ریگای لەپێش میللیبوون کردۆتەوە، هەوڵیداوە کۆمەڵگاکەی و پەرەسەندنە میللیەکەی خۆی بپارێزێت. هەرچی گەلانی دیکەی موسلمانیشن ویستویانە لەمیانی شێوەی دەسەڵاتداریی ئیسلام، واتە لە ریگای سوننیگەراییەوە پەلهاوێشتن بکەن.

کوردەکانیش لە نێوان هەر دوو مەزهەبی (شیعە و سوننە)دا ماونەتەوە. کوردەکان لە مەزهەبێکی ئیسلامیدا خۆیان میللی نەکردووە. سونیگەرایی تورکەکان، لە چوارچێوەیەکی دیاردا خزمەتی تورکبوونی کردووە. بە تایبەتی تورکەکان بە هۆی پەرەسەندنی بە دووریان لە عەرەبەکان و رووبەڕوو بوونیان لەگەڵ جیهانی مەسیحیەت، لای ئەوان ئیسلامبوون بە واتای تورکبوون هاتووە. ئیسلامیەتی دەستی تورکەکان کاریگەریەکی دیارکەری لەسەر پەرەسەندنی میللی تورکدا هەبووە.

مسۆگەر پێویستە ئیسلامیەتی تورکەکان وەکو ئایینێک سەیری نەکرێت. پێویستە وەک ئایدیۆلۆژیایەکی میللی بیری لێ بکرێتەوە. واتای سەنتێزی تورک- ئیسلامیش بەمجۆرەیە.

ئیسلامیەت لای تورکەکان پێشخستن و پەرەسەندنی نەتەوەبوونی تورکە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان.

ئەگەر ئیسلامیەت نەبووایە، مەحاڵ بوو تورکەکان لە رۆژهەڵاتی ناوین پەرەسەندنێکی نەتەوەیی بە خۆیانەوە ببینن. دەسەڵات و داگیرکاری تورک تەنیا لە

ڕێگای ئیسلامەوە توانیویەتی پەلبهاوێژێت، خۆی لەسەر پێ بهێڵێتەوە، بۆ ئەمەش بوون بە شمشێری ئیسلام، لە ژێر ناوی بڵاوکردن و بەرفروان کردنی ئیسلام ویستویانە وەڵامێکی ئایدیۆلۆژی بدەنەوە. لەو چوارچێوەیەدا دەڵێین ئیسلامبوونی تورکەکان لە جەوهەری خۆیدا هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نییە، لە جەوهەردا شێوەیەکی بڵاوبوونەوهو پەلهاوێشتنی میللییە. پێویستە ئەوە بە باشی ببینین. چونکە لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا لە تورکیا هێشتا ئیسلامگەریتی بەردەوامە. ئەگەر چاوێک بە بنەما مێژوویەکاندا بخشێنینەوە، ئەوا دەتوانین وەکو شکڵێکی شۆڤەنیزمی تورکی هەڵیسەنگێنین و شرۆڤەی بکەین.

لەو بڕوایەدا نیم کە تورکەکان شتێکیان لە جەوهەری شۆڕشگێری ئیسلام وەرگرتبێت. تورکەکان سەرجەم زانیاریە ئیسلامیەکان و هەروەها عەرەبی فێر دەبن! بەڵام هیچ کامیشیان لە عەرەبی تێناگەن.

ئیسلامگەرایی تورکەکان تا دوا رادە ئەزبەرەو دەمامکدراوە. بەڵام سەرەرای ئەوەش پێویستیەکی سەسوڕهێنەر دابین دەکات، ئەویش بەدیهێنانی باڵادەستی میللی تورکە لە ئەنادۆلی شوێنی موزائیکی گەلان و بەلقانەکان. لەمیانی ئەو دەمامکە ئایدیۆلۆژیەی کراوە بە ئامرازێکی دەسەڵات و باڵادەستی، بە ناوی خوداوە خۆیان وەک خاوەنی بەلقانەکان، ئەنادۆڵ، قەفقاسیا و بگرە خۆیان بە خاوەنی رۆژهەڵاتی ناوینیش نیشان داوە.

بەڵێ عوسمانیەت و سەلجوقیەت وەهایە. سێبەری خودان لەسەر زەوی و تەنانەت لەبەر ئەوەی خۆیان وەکو نوێنەری خودا پێناسە کردووە، ئیتر خاوەنی زەوی و خاکن و بەرپرسیاری هەموو شتێکن. ئەمەش ئەو واتایە دەبەخشێت؛ سەرجەم بەگ و سەرۆکە تورکەکان بە ناوی خوداوە خاوەنی ئەو زەویانەن. پێویستە ئەو خاک و زەویانە لە گاوڕەکان وەربگرن و بە موسلمانەکان بدرێت؛ واتە ئەو خاکە لەو گەلە خۆجێییانە بسەندرێت کە بە هەزارن ساڵە لێرە نیشتەجێ بوون و بە سەرۆک و بەگە پەلاماردەرە تورکەکان بدرێت. ئێستاکە دەزانین کە ئەوە لە هەمانکاتدا ڕووداوێکی چینایەتیە. پێویستە بە باشیدەرک بەم خاڵە بکرێت. کاتێک سەرۆک و بەگە تورکەکان دووچاری جیابوونەوەی چینایەتی دێن، چینە ژێر دەست و چەوساوەکانی خۆیان ناچاری راکردن بەرەو چیاکان دەکەن. بەڵێ لێرەدا جەوهەری ئیسلام و تا رادەیەکیش دەلالەتی عەلەوێتی واتادار دەبێت. شکڵی زیانباخشی ئیسلامیەت لە دەستی ئەواندا مانایەکی بەمجۆرە بەدەست دێنێت. ئەو

شـێوە دەسـەڵاتگەرایـەی ئایـدیۆلۆژی بـە تـەواوەتی شـێوەیـەکی هێرشـکردنە. شـێوەیـەکی ئیمپەریالیسـتی یـە و خـوین لـە گـەلان دەچۆڕێنێـت. هـەڵبەتـە گـەلی کوردیش بەشی خۆی لەمە وەردەگرێت.

لێـرەدا ئەمـە دەبیـنم؛ هـەم ئـامرازێکی هێرشـی ئـیمپەریالیسـتییە، هـەم لـە جیابوونەوەی چینایەتیدا ئامرازێکی هێرشدن جێگای باسە. مەزهەبی ئیسلامی زاڵ و دەسەڵاتگەرا یاخود رژێمە سیاسیەکەی ناوەڕۆک و چۆنیەتیەکی بەمجۆرەی هەیە. لە قۆناخەکانی پەرەسەندنیەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان پێویستە هیچ کاتێک ئەو خەسڵەتە بنەڕەتیەی لە بیر نەکرێت. شێوەی فەرمی ئیسلامیەت لە سەرکوتکردنی جیابوونـەوەی کۆمـەڵایەتیـدا تونـدو تیژیـەکی زۆر بـەکار دێنێـت. کەسێکی وەکـو "مـوراد پاشـای بیرهـەڵکـەن" (٤٠) هـەزار عەلـەوی دەخاتـە نـاو بیرەکانـەوە و بێ هـەژمار کۆمـەڵکـوژی هاوشـێوەی ئەمـە رووی داوە!... هـەروەها لایـەنێکی بەمجۆرەشی هـەیە کە بـە ئامـانجی ئیمپەریالیستی بەکاردەهێنرێت. لـە ژێر نـاوی جیهـاد، لـە ژێـر نـاوی شـەڕکـردن لـە دژی کـافران تـا ناوەراسـتی ئـەوروپا وەکـو چەکێکی هێرشکردن بەکارهێنرا. ئەوە زۆر روون و ئاشکرایە.

واتە ئایین لە دەستی تورکەکاندا بە تـەواوەتی نەتەوەپەرسـتییە، بـە تـەواوەتی شۆڤینیزمێکە. هەم وەک ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی ئیمپریالیستی رۆڵ دەگێرێت، هـەم لەبەرامبەر چینە چەوساوەکان وەکو ئامرازێکی هێرشکردن بەکار دەهێنرێت. لـەم سۆنگەیەوە؛ پێویستە سۆسیال شۆڤینیزم تەنیا وەک خەسڵەتێکی گرووپە بـە بنەچـە کۆمۆنیسـت یـاخود سۆسیالیسـتەکانی تورکیـا بیـری لـێ نەکرێتـەوە. لـە حاڵـەتێکی وەهادا نەک تەنیا لە هەندێک رەوت و تەریقەتگەرای بە بنەچە ئیسلامگەرای رۆژی ئەمڕۆمان بەڵکو دەبێ خەسڵەتی پەلاماردەرانـەی سۆسـیال شـۆڤینیزمی سـەرجەم قەلەمبازە مەزهەبیەکانی مێژوو ببینین.

باسـی ناوەڕۆک و خەسڵەتی میللی مەزهەبی شیعەی ئێرانمان کرد. کولتووری بەهێزی فارس و نەریتە سیاسیەکەی لـەجیاتی ئـەوەی بـە تـەواوەتی ئیسـلام بکاتـە دوژمنی خۆی بە تایبەتی لایـەنگرێتیی حـەزرەتی عـەلی پەسـەند کـرد کـە لایـەنگری چەوساوەکانە، بەو چەکە وەڵامی شێوەی ئایدیۆلۆژی دەسەڵاتی دایـەوە: واتـە بـەو چەکە وەڵامی شێوەی دەسـەڵاتداریتی ئەمـەوی، عەباسـی و تەنانـەت عوسـمانی و هاوشـێوەکانیان دەداتـەوە. ئێسـتاش ئـەو چەکـە بـە شـێوەیـەکی کاریگـەر بـەکار دەهێنرێـت. بـەڵام وەک دەبینـین ئەمـەش بەرامبـەر بـە گـەلانی دیکـە کـراوە بـە ئامرازێکی شۆڤینیستی و نـاوە بـە نـاوە چالاکانـە ئـەو ڕۆڵـە دەبینێت. بە تایبـەتیش

کاتێک سەیری سیاسەتی کوردستان دەکەین، دەبینین لەبەر هۆکاری جیاوازەوە لای کوردان ئیسلام بە مەزهەبێکی میللی نەگەیشتووە. بەڵام ئەو دۆخە لای گەلاکانی دیکە بە شێوەیەکی جیاوزتر پێشکەوتووە. بۆ نموونە مەزهەبی پرۆتستانی سەردەمی پەرەسەندنی میللی لە ئەوروپا هێز و تینێکی زۆری بە نەتەوەبوون بەخشیوە. بە تایبەتیش ئەزموونی "لوتێر" لە ئەڵمانیا سەرنجراکێشە. لەخۆڕا نییە کە چەندین کڵێسا بوونەتە قوتابخانەی پەرەسەندنی میللی. هەروەها نەتەوەگەرایی بەلقانەکانیش لە بنەڕەتدا لە کڵێسا سەرچاوەی گرتووە. لە ئێرانیش پەرەسەندنێکی هاوشێوە لە ئارادایە. لای تورکەکانیش ئەوە زۆر بەرجەستە و کۆنکرێتییە. بەڵام کاتێک کورد دەبنە مژاری باسکردن، دەبینین کە مەزهەبێکی کورد- ئیسلام پەرەی نەسەندووە تا بکەوێتە خزمەتی پێشکەوتنی میللی خۆی. هەروەها پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین کە ئیسلامیەت لای عەرەبەکان خۆی لە خۆیدا عەرەبیەتە (عروبەیە). یەکێک لە نوێڵە هەرە بەهێزەکانی نەتەوەپەرەستی عەرەب و بناخە مێژووییەکەی ئیسلامیەتە. بەڵام کوردەکان لەو مژارەدا دۆخی هەرە بێ چانسیان بەرکەوتووە. لە ڕێگای ئایدیۆلۆژیای ئیسلامەوە یاخود لەژێر کاریگەری ئیسلامەو سەرۆک عەشیرەتە دەرەبەگەکان بۆ فیودالیتەی کورد گۆڕاون، بەڵام ئەوە بە تەواوەتی لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی پەرەسەندنی میللی خۆی بووە.

عەشیرەتگەرایی، ئاغاو بەگ و توێژە دەسەڵاتدارەکانی هاوشێوەیان کە بوون بە موسلمان تورکبوون، بە عەرەببوون و بە فارسبوونیان بۆ خۆیان بە بنەما وەرگرتووە. واتە بەو رادەیەی کوردەکان وازیان لە کوردایەتی هێناوە، بوونەتە ئیسلام. ئەگەر بە تەواوەتیش نەبێت لای ئێمە، بە تایبەتیش لە چینی سەرەوەدا، واتە لە چینە بەکرێگیراوەکاندا ئیسلامبوون نکوڵیکردنی میللی خێرا دەکات. بێگومان بە دەمامکی ئیسلامەوە پێشخستنی نکوڵی لەلایەن چینی سەرەوە رەنگدانەوەیەکی نەرێنی و خراپی لەسەر گەلیش دەبێت. بەمجۆرە ئاراستەیەکی خێرا بەرەو قۆناخی نکوڵیکردنی میلل جێگای باسە. هەرچەندە لە مەدرەسەکاندا روون کردنەوەی ئیسلامیەت بە کوردی بیری لێکرابێتەوەش، بەڵام کاریگەریەکەی سنووردارە. لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا لە دەوروبەری شاری بەدلیس هێشتا هەندێک پێشکەوتنی میللی دەبینرێت کە ریشەی بۆ مەدرەسەکان دەگەڕێتەوە. لە راستیدا "سەعیدی نورسی" یش بەرهەمێکی کولتووری مەدرەسەیە، بەڵام لە ڕۆژی

ئەمرۆماندا سەعیدی نورسی لە دەستی سۆسیال- شۆڤینیزمی تورکدا وەک بەهێزترین چەک بەکار دەهێنرێت. واتە وەکو ئامرازێک لە دەستی شۆڤینیزمی تورک رزگاری نەبووە.

کەواتە لای کوردان ئیسلامیەت ئامرازێکی پێشکەوتنی میللی نییە، رۆڵی پشتگیریکردنی نکوڵی میللی دەبینێت، بە تایبەتیش بە دەستی چینی بەکرێگیراوی کورد ئەو رۆڵەی گێڕاوە. ئەمە راستیەکی مێژوویی گرنگە. کاتێک نیقاش و گفتوگۆی ئیسلامی دەبێتە جێگای باس، دەکەونە نێو هەڵەیەکەوە کە زۆر بەربڵاوە. ئەو هەڵەیەش ئەوەیە؛ هەڵسەنگاندن و شرۆڤەی وەها دەکرێت گوایا ئیسلامیەت هیچ پەیوەندیەکی بە پێشکەوتنی میللییەوە نییە. ئەگەر بووترێت کە ئیسلامیەت پێشکەوتنی میللی عەرەبە، ئەوا بزاوتی گەلانی دیکەش دەبێتە مژاری باس. ئەگەر بووترێت کە شیعەتی پێشکەوتنی میللی فارسە، ئەوا رێگا لەبەردەم پێشکەوتنی میللی ئەوانەی بەرامبەری دەکاتەوە. ئەگەر بووترێت ئیسلامیەت لە تورکەکاندا خزمەتی تورکایەتی کردووە و ئامرازی هەرە بنەڕەتی بەرفراوان بوون و پەلهاوێشتنی تورک بووە، ئەوا بزاوتی میللی گەلانی دیکە دەبێتە مژاری باس. لەو روانگەیەوە لەگفتوگۆکانی سەبارەت بە ئیسلامیەتەوە، بە جۆرێک رەفتار دەکەن کە گوایا هیچ پەیوەندییەک لەنێوان ئیسلامیەت و پەرەسەندنە میللیەکانەوە نییە. لە راستیدا ئەوە چەواشەکاریەکی جدییە. لەو بڕوایەدام کە لەرێگای ئەو چەواشەکاریەوە تا رادەیەکی زۆر راستییەکان داپۆشراون. بێگومان هەندێک لایەن هەیە کە لە گفتوگۆکانماندا پێویستە ئیسلامی تێدا زەق بکرێتەوە. ئایا جێگای ئیسلامیەت لە نەتەوەپەرستی عەرەب، نەتەوەپەرستی تورک و نەتەوەپەرستی فارسدا چییە؟ پەیوەندی نێوان ئیسلامیەت و کوردایەتی چییە؟ ئەو پەیوەندییە بە درێژایی مێژوو چۆن بووە؟ لە ئاستی دەڤەر، تیرە و عەشیرەتە جیاوازەکان پەیوەندی نێوان ئیسلام و کوردایەتی چۆن ئاراستەیەکی هەبووە؟ پێویستە بە بایەخەوە هەڵسەنگاندن سەبارەت بەو دۆخە بکرێت و شی بکرێنەوە. راستییەکان بە فڕوفیشاڵ و زێدەڕۆییەکی مەزنەوە خنکێنراون و شاردراونەتەوە. چەندین کەسایەتی ئایینی وەک شێخ و "ئەولیا" کە لەناوکوردان دەرکەوتوون بە تایبەت لەو مژارەدا رێگایان لەپێش چاوپۆشکردن کردۆتەوە. هەروەها چەندین بیرمەندی ئیسلامی میللەتە دەسەڵاتدارەکانیش پێویستیان نەبینیوە دەست بۆ ئەو بابەتە ببەن. بەڵام لەوە دڵنیام کە ئەرکی سەرەکییان- ئەگەر هەر ڕۆژ بڵێن شکۆداربوونی ئیسلامیەت رێگای خودایە و دووبارەی بکەنەوە- داسەپاندنێکی مەزنی شۆڤینیزمە

بەسەر راستینەی کۆمەلایەتی و میللییەوە. مێژوو پڕ لە هەولدانی بەربلاو و بەرفراوانی بەمجۆرەیە. ئەرکی کەسایەتییە ئایینیەکانی کوردانیش لەمە زیاترتێپەر نابێت. وەک چۆن بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ چەپرەوێتی کورد لەژێر کاریگەری چەپرەوێتی تورکیا سڕابوویەوە و بێ کەسایەتی کرابوو، زانا ئایینیەکانی کورداکانیش بە درێژایی مێژوو لە ژێر کاریگەری ئایدیۆلۆژی دەسەلاتداری میللەتە سەردەستەکان مارژینال بوون و وەک کۆپییەیەکی ئەوان ماونەتەوە و هەروەها بە ناسنامەیەکی ناسراو و بە پڕەستیژ نەگەیشتوون. لە راستی نالێین مسۆگەر ئەوە لە گەوهەری ئیسلامدا هەیە، بەلام واقیعەکە بە تەواوەتی بەمجۆرە پێشکەوتووە. وەک چۆن لە هەر ئایدیۆلۆژیایەک روودەدات، پەرەسەندنێکی هاوشێوە روویداوە. لە قۆناخە جیاوازەکانی هەر سیستەمێکی کۆمەلایەتیدا دەشێ رووبەروی دۆخێکی بەمجۆرە ببینەوە. وەک ئاگادارین کە سۆسیالیزمی بونیادنراویش بە تایبەتی بە دەستی نەتەوەی دەسەلاتداری ڕووسدا رۆلێکی هاوشێوەی گێڕاوە. لەو روانگەوە ئەم دۆخە تەنیا لە میللیگەرایی پشتبەستوو بە سەرمایەداری لە ئارادا نییە. ریال سۆسیالیزمی رووسەکانیش بە خەسلەتێکەوە پەرەی سەندووە کە کاریگەریە شۆڤینیەکەی بەسەر گەلانی دیکەوە زۆر بەهێز بووە.

ئاشکرایە کە پەرەسەندنی نەتەوەی ڕووس لەسەر حیسابی گەلانی دیکە لەپێشترە. تەنانەت هەندێک جار بە ڕەهەند و ئاستی ئیمپریالیستی گەیشتووە. لەو سۆنگەوە؛ گەورەترین هۆکاری هەلوەشانەوەکەشی سەرچاوەی خۆی لەو تایبەتمەندیە ئیمپریالیستیەیەوە وەردەگرێت. لینین بەر لە مردنی گوتوویەتی:" ئایا ستالین دەبێتە ئامرازێکی شۆڤینیزمی مەزنی ڕووس؟". لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا دەبینین کە لەو گومانەیدا مافدار بووە.

حەزرەتی محەمەد(د.خ) یش دۆخێکی هاوشێوەی ئەمەی هەیە. حەزرەتی محەمەد هەست بە بالادەستی عەرەب دەکات و دەیبینێ. لەو چوارچێوەیەدا دەفەرمووێ پێویستە جیاوازی لەنێوان عەرەب و عەجەم نەبێت، بەلام سەرەرای ئەمەش ئەو جیاوازی و بالادەستییە بەرچاوە. ئاگادارین کە ئەوە دواتر چۆن بە ئاستی پەلهاوێشتن و لەناوبردن گەیشت. لەسەرجەم ئەو شرۆڤەاندا دەمانەوێت بلێین: کەم نین ئەو ئایدیۆلۆژیانەی کە سەرەتا رێگایان لەبەردەم شۆڕشی گرنگ کردۆتەوە، بەلام دواتر لەمیانی بە ئیمپریالیست بوونیان خزمەتی سەرمایەدارییان

کـردووه. وەک چـۆن ئەمـە لـە نەتەوەپەرسـتی سـەرمایەداری و ئیسـلامیەتدا روویـداوه، دۆخێکـە شۆڕشـە سۆسیالیسـتیەکانی سۆسـیالیزمی بونیـادنراویش دووچـاری هـاتوون. ئـەوە لادان و چەواشـەکردنە، یـەکێک لـەو گەلانـەی تووشـی مەترسیدارترین هەڵوێستەکانی هاتووە گەلی کوردستان و راستینەی نەتەوایەتی ئەو گەلەیە.

ئێمـە نـاوە بـە نـاوە ئـەو هـەڵسـەنگاندن و شـرۆڤەمان کـردووە: لـە قۆناخـە گرنگـەکانی مێـژوودا پـەیوەنـدی ئیسـلامیەت بـە راسـتیەکەمانەوە، لەسـەر بنـەمای گەوهـەری شۆڕشـگێری و نوێنەرایـەتی یەکسـانی نـەبووە، تـەواو بـە پێچەوانـەوە لەسـەر بنـەمای لـەناوبردنی راسـتینەکەمان، ڕێگاکردنـەوەی لـەپێش نایەکسـانی و نادادپـەروەری بـووە. بـە واتـایـەکیتر، هـاتنی ئیسـلامیەت بۆ کوردسـتان لـە لایەنـە شۆڕشگێڕیەکەی زیاتر بەشێوەیەک بووە کە لایەنە ئیمپریالیستیەکەی لەپێش بووە. هەم پەلهاوێشتن و بڵاوبوونـەوەی ئیسـلام لـە بـواری ئایدیۆلۆژی و ئـابووری، لـە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئاستی سیاسیەوە، بە رادەیەکی زۆر کەم جێگا بـە راسـتینەی میللی و کۆمەڵایەتی کورد دەدات. بەشێکی زۆری ئەو فاکتەرانەیـان لـەناو بردووە، هەڵبەتە بەرپرسیاری سەرەکی ئەمەش چینی بەکرێگیراوی دەسـەڵاتداری کـوردە. هێشتاش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا کاتێک سەیری ئەو چینـە بـەکرێگیراوەی کـورد دەکەین، لەبەر ئەو هۆکارە مێژوویانـەیە دەبینین کـە خزمـەتکار لـە پاشـا پاشـاترە، لەئیسلام ئیسـلامیترە، لـە تـورک تـورکترە و تـا لایەنـەکانی دیکـەی. دەکـرێ هـەمان شت سەبارەت بە نەتەوەپەرستی سەرمایەداریش بووترێت.

ئـەو نەتەوەپەرسـتیە سـەرمایەداریەی لـە ژێـر دەسـەڵاتـی تورکەکانـەوە لـە ڕۆژئاواوە گواستراوەتەوە، سەبارەت بە کوردان و نەتەوەبوونی کورداندا هێندەی ئیسـلامیەت کاریگـەری هـەبووە. یـەکێک لـە فاکتـەرە گرنگـەکانی دووڕوویێتـی نەتـەوەبوونی تـورک نەتەوەپەرەسـتی سـەرمایەداریە. ئایـدیۆلۆژیای میللیگـەرایی سـەرمایەداری لـە نەتەوەبوونـدا دووەمـین ئـامرازی گرنگـی ئایـدیۆلۆژی دەسـت دەسەڵاتدارانی تورکە. وەک چۆن ئیسلامیەت لە هـەوڵی پاکتـاوکردنی کوردایەتیـدا بووە، هەروەها لە لەناوبردنی چەندین گەلدا ڕۆڵی ئامرازی گێڕاوە، نەتەوەپەرسـتی سەرمایەداریش بە تایبەتی لە سەدەی دواییدا بەرامبەر بە گەلانی دیکە، بۆ نموونـە لـە بەرامبـەر ئەرمەنیـەکان، رۆمـەکان و گـەلانی بـەڵقانـەکان لـە ڕێگـای کۆمـەڵکوژکردنیانـەوە بـووە بـە ئـامرازێکی لـەناوبردن. نەتەوەپەرسـتی تـورک لـە رابـردوو لـە ڕێگـای ئیسـلامیەتەوە گـەلانی کۆمـەڵکوژ دەکـرد و لـەناوی دەبـردن،

ئەمجارەش ئەو كارەی خۆی لـە ڕێگای ئـەو نەتەوەپەرستیەوە ئـەنجام دەدات. بە شێوەیەكی سیستەماتیک پاشماوەی ئەو گەلانە لە ئەنادۆڵ پاک دەكاتەوە. شـێوازی بەرفراوانی ئەمەش لەسەر كورداندا جێبەجێ كراوە.

نەتەوەپەرستی سـەرمایەداری تورک بە تایبەتی لە مێژووی كۆماری توركیـادا دەیەوێت كردەوەكانی ئیسلامیەت لـە سـەدەی نۆیەمدا تـەواو بكات و بە ئـەنجامی بگـەیـەنێت. ئـەوەی لـەڕێگای ئـامرازی هێرشـی ئایـدیۆلۆژی ئیسـلام تـەواو نـەبووە، خوازیارە لەمیانی زهنیەتی سـەرمایەداری ژێـر حـوكمڕانی و دەسـەڵاتی تـورک بە ئــەنجامی بگــەیــەنێت و بــە یــەكانگیركردنی هــەردووكیان هێــرش دەكــات. بــە بەكارهێنانی بەكرێگیراوانی كوردیش هـەوڵی بەربەسـتكردنی نەتەوەپەرسـتی كـورد دەدات. هــەروەک چـۆن دەرفـەت بـە كوردبـوونی ئیسـلام نـەدراوە، دەرفـەت بـە كوردبـوونی نەتەوەپەرسـتیش نادرێـت. لیـرەدا نەتەوەپەرسـتی تـەنیا تایبـەت بـە توركایەتییـە. ئـەو لۆژیكـەش لـە روانگـەی ئەوانـدا مـەرجێكی دەسـت لێبەرنـەدراوە. موسلمانێتی سـەردەسـت و حـاكم تـەنیا تایبـەت بـە توركێتییـە. لـەمیانی هێرشـەكانی ڕۆژگــاری ئــەمڕۆمان هەوڵــدەدەن  لــە بــواری نەتــەوەبوون و كۆمــەڵگــابوون كوردستان لـە مێژووی جیهـانی دوور بخەنـەوەو لـەو ڕووەشـەوە سـەركەوتن بـە دەست بێنن.

كەواتە ئەوەیان واقیعێكی جدییە كە نەتەوەپەرستی سـەرمایەداریش لای ئێمـە نـەبووە بـە رووداوێكـی میللـی، تـەواو بـە پێچەوانـەی ئەمـەوە بـە دەسـتی چینـی دەسـەڵاتدار بـووە بـە ئـامرازێكی لـەناوبردن و پاكتـاوكردن. كاتێـک سـەبارەت بـە نەتەوەپەرستی گفتوگۆ دەكەین پێویستە سەبارەت بەو بابەتـە ئاگـادار بین: لایـەنی نەتەوەپەرستی نەتەوەی سـەردەست چ رۆڵێكی لەناو نەتەوەی چەوساوە، یاخود چ رۆڵێكی لە پەرەسەندنە نەتەوەییەكەیدا هەیە؟ پێویستە ئـەو بابەتـە بـە باشـی روون بكرێتەوە. دەكرێ كۆمۆنیزمیش بخـەینە ناو ئەو چوارچێوەوە. ئەو "كۆمـۆنیزم"ـەی بــە دەســتیTKP (پــارتی كۆمۆنیســتی توركیــا) پێشــخراوە، وەک شــێوەیــەكی نەتەوەپەرستی (میللیگەرایی) تورک پێشكەوتووە. هەڵبەتە كاتێک دەڵێی سۆسـیال-شۆڤینیزم واتای ئەوەیە كە ئایدیۆلۆژیای كۆمۆنیستییاخود سۆسیالیستی بكرێت بە ئـامرازێكی پەلهاوێشـتنی شـۆڤینیزمی میللـی. بـەر لـە هـەموانیش مێـژووی TKP لەژێر دەمامكی كۆمۆنیستیەوە خراوەتە ژێر خزمەتی نەتەوەپەرستی توركەوە. بەر لە دامەزراندنی كۆماری توركیا داخوازی مستەفا كەمال بۆ دامەزرانـدنی پارتیـەكی

کۆمۆنیستی ساختە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا پیشانی دەدات کە نەتەوەپەرستی تورک بە چ شێوەیەک ویستوویەتی کۆمۆنیزم وەکو ئامرازێک بەکار بهێنێت. لە رێگای پارتی کۆمۆنیستەوە دەیەوێت کۆمۆنیزم لە چوارچێوەی پارتیەکی میللی و ئامانجەکانی خۆیەوە پێشی بخات و بەکاری بهێنێت.

لە راستیدا دامەزراندنی پارتیەکی میللی کۆمۆنیستی دەکرێ بە نیاز پاکیش بێت. بەڵام لەبەر ئەوەی TKP وەک پارتیەکی کۆمۆنیست نەتەوەپەرستێکی زۆر شۆڤینی بووە، تەنانەت لەو پارتەش میللیگەراتر بووە کە مستەفا کەمال بیری لێ دەکردەوە، لە نەتەوەبوونی تورکدا وەکو فاکتەر و ئامرازێکی زۆر کاریگەر بەکاری دەهێنێت. لە ئەنجامدا TKP بوو بە پارتێک کە لە پارتی میللی کۆمۆنیستی مستەفا کەمال زیاتر لایەنی شۆڤینی تورکی لەپێشە، نکوڵی لە راستینەی نەتەوەیی کورد کرد و وەک دەزانین لە کەمالیستەکان زیاتر دەیانگووت: کوردان "ناشارستانین"، "دواکەوتوون" و پێویستە بخرێنە ژێر گوشارەوە و سەرکوت بکرێن. بە کورتی کۆمۆنیستی دەست نەتەوەپەرستی تورک، ئەرکی ئایدیۆلۆژی لەناوبردنی نەتەوایەتی گێڕاوە.

وەک دەزانین کۆمۆنیزم لایەنی ئەنتەرناسیونالیشی هەیە. لە کاتێکدا پێویست بوو کۆمۆنیزم یەکسانی نەتەوەیی، دادپەروەری نەتەوەیی و یەکسانی ماف بەشێوەیەکی راست لە پەرەسەندنی میللیدا پێشانبدات، - بۆ نموونە، لە یەکێتی سۆڤیەت هەر چەندە سنوورداریشە، بە جێبەجێ کردنی ئەو شتانە رێگای لەبەردەم دروست بوونی فیدراسیۆنێک کردەوە- بەڵام لای تورکەکان بە تەواوی بەرەو ئەنجامی "کورد بوونی نییە" رۆیشتووە. ئەوەش روون و ئاشکرایە هەندێک دەریاسا یاسا و رێسای گشتی ناگۆڕێت.

بەمجۆرە ئەوە دەبینین؛ تەنانەت کۆمۆنیزمیش لە دەستی نەتەوەپەرستی تورکدا بە تەواوی بووە بە ئامرازێکی خزمەتکردنی باڵادەستی و پەلهاوێشتنی نەتەوەیی. لایەنی سەردەست ئەمەیە. لەو روانگەیەوە کاتێک سەیری مێژووی چەپەکانی تورکیا دەکەین، دەبینین لە هەر سەردەمێکدا بە هەڵوێستێکی خزمەتکار لە پاشا پاشاترە هەڵپەیەتی و بەرەو نەتەوەپەرستی تورکەوە رادەکات.

قۆناخی دەرکەوتنی PKK دەزانرێت. بە ساڵان لەمیانی تێکۆشان لە دژی سۆسیال- شۆڤینیزم هەوڵماندا شکڵێک بە خۆمان بدەین. لە کاتێکدا خۆمان وەکو سۆسیالیست پێش دەخست، لەجیاتی شەڕی نەتەوەپەرستی و دواکەوتوویی، تەواو بە پێچەوانەوە لەگەڵ سۆسیال-شۆڤینیزم لەناو شەڕدا بووین کە

سەرچاوەی خۆی لەو دەوروبەرانەوە دەگرت کە بە ناوی سۆسیالیزم دەستیان پێکردبوو. ئەوە رێکەوت نییە. چونکە سۆسیالیزمی دەست نەتەوەپەرستی تورک یاخود سۆسیالیزمی دەست ئەو نەتەوەپەرستییەی بووە بە TKPیی، وەک بڵێی بۆ لەناو بردن و ئاستەنگ کردنی لایەنی باشی سۆسیالیزم لە پەرەسەندنی نەتەوەکان و رێگای رزگارییان رۆڵ دەگێڕێت. رێگای پێنادات و دەڵێت:" سۆسیالیزم بۆ کوردان نابێت". دەڵێن" هەتا لە تورکیا شۆڕش دروست نەبێت، ووتنی هەر شتێک سەبارەت بە کورد هەڵەیە، ئەگەر بیڵێن بە پێچەوانەی ئەنتەرناسیۆنالیزم(ناونەتەوەیی) دەبێت". لە کاتێکدا خۆی بە تەواو عەیار نەتەوەپەرستی جێبەجێ و پەیڕەو دەکات، ئەو کارەی ئەو نابێت بە پێچەوانەی ئەنتەرناسیۆنالیزم، بەڵام داخوازی ئێمە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی لە رێگای سۆسیالیزمەوە، دەبێت بە شۆڤینیزم!

هەڵبەتە هەمان ئەو شێوازەی هەڵخەڵەتاندن بۆ ئیسلامیەتیش تێپەر دەبێت. دەڵێن "نەژادپەرستی لە ئیسلامیەتدا بوونی نییە". هەروەها دەووترێت" لەسەر ئەو بناخەیە بیر لە ئیسلامیەت ناکرێتەوە". بەڵام لە راستیدا ئەوانەی ئەوە دەڵێن لایەنی شۆڤینی پلە یەکن. تا دوا رادە عەرەبایەتی، فارسایەتی و تورکایەتی دەکەن، بەڵام لەو بابەتەدا ئیسلامیەت کۆسپ و تەگەرە نییە. بەڵام بۆ داخوازی نەتەوەیەکی چەوساوە بۆ ماف- یەکسانی، داواکاریەکەی بۆ چەمکی دادپەروەری دەبێتە کۆسپ و تەگەرە! ئەگەر داوای تۆزێک دادپەروەری بۆکوردان بکرێت؛ لەپێناو پەرەپێدانی زمان، کولتوور، ئابووری و گەشەپێدانی بوارە هەمەجۆرەکانی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی داوای تۆزێک ئازادی بکرێت، ئەوە دەبێتە نەژادپەرەستی! بەڵێ ئەوەیە شۆڤینیزمی دەمارگیر و کوێرانە. لە رۆژی ئەمرۆشماندا تا رادەیەکی زۆر بە کاریگەرە. هەر ئەمەشە کە بەسەر کۆمۆنیزمدا هاتووە. لەو بارەوە خودی نەتەوەپەرستی لەپێناو سۆسیال- شۆڤینیزمێکی بێ سنوورە.

کەواتە تێکۆشانی چەندین ساڵەمان لە بەرامبەر سۆسیال- شۆڤینیزم واتادارە. واتای کۆمەڵایەتی هەیە. سۆسیال- شۆڤینیزم بە شێوەیەکی یەک لایەنە کۆمۆنیزمی گرتۆتە دەست؛ بۆیە دەڵێت:" ئەوە پێشکەشی نەتەوەی بندەست ناکەم، هیچ نەتەوەیەکی بندەست و چەوساوە ناتوانێت بە چەکی سۆسیالیزم بکەوێتە ناو مەسەلەی نەتەوەییەوە، پاوانەکەی تەنیا لەدەستی خۆمدایە، ئەگەر لەدەستمی

دەرخەی لە ناوت دەبەم، لە مۆسكۆو لە ئەوروپا شكایەتت لێ دەكەم" لە ئەنجامدا ئەو كارانەشی كرد.

بە زۆری و زەحمەتیەكەوە ئەوەمان لەدەستی دەرهێنا، بەمجۆرەش توانیمان ئافرێنەری سۆسیالیزم، واتە سۆسیالیزمی سەربەخۆ جێبەجێ و پەیڕەو بكەین. لەو مژارەدا بە راستی PKK هەڵسەنگاندنێكی باشی بۆ وڵاتپارێزی هاوسەنگ وبە پرەنسیپانە ئەنجامداوە. شی كردنەوەی راستی بۆ چییەتی سۆسیالیزم كردووە و بە شێوەیەكی سەركەوتووانە بەگوێرەی واقیعی وڵات جێبەجێی كردووە. بێگومان ئەوەش بە تێكۆشانێكی بێ ووچان و دژوار بەدیهاتووە.

ئێستاكە سەیر دەكەین لە كاتێكدا تێكۆشانی رزگاری نەتەوەییمان دەكەوێتە سەردەمێكی هەرە گرنگ و ئەنجامیگرەوە، دەبینین لەناكاو شتێك بە ناوی "حزبوڵا"وە دەركەوتووە. ئەو پێكهاتەی لەژێر دەمامكی حزبوڵاو لەژێر ڕۆشنایی ئەو راستییە مێژووییانە دەیانەوێت بە سەرمانیدا بسەپێنن چییە؟ هەڵبەتە هۆكاری تاوتوێكردنی بابەتەكە لە رووی مێژوویەوە، بە ئامانجی روون كردنەوەی ئەو مەسەلەیە بوو. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا دۆخێكی زۆر ئاڵۆز و تێكەڵ دەردەكەوتووە. لەگەڵ هەرەسهێنانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا هەوڵدەدرێت بە خێرایی كۆمۆنیزم رەش بكرێت و لە پێش چاو بخرێت. لە راستیدا لە رۆژی ئەمڕۆماندا گفتوگۆیەكی باشتر لەو بارەیەوە دەكرێت و دەبینرێت كە ئەزموونی ڕوسیا چەندە كۆمۆنیستی بووە، كەی لە كۆمۆنیزم دوور كەوتۆتەوە؟ چ كاتێك بووە بە ئیمپریالیستی؟ یاخود تایبەتمەندییە ئیمپریالیستیەكانی كامانەن؟ ئەوانە گفتوگۆیان لەسەر دەكرێت و سۆسیالیزمی بونیادنراو لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا تا رادەیەك كاریگەری خۆی لە دەستداوە. بە تایبەتیش ئەو وێرانكاریانەی بە دەستی TKP ئەنجام دراوە، ئیتر لە چوارچێوەی مەترسی دەركەوتووە. هەروەها تێگەیشتنێك دەرهەق بە تێكۆشانی مافدارمان دژ بە سۆسیال- شۆڤینیزم دروست بووە و لەو بارەوە تێكۆشان سەركەوتووە. لەو چوارچێوەیەدا ئەو مەترسیانەی لەو كەناڵەوە بێن ئیدی زۆر جێگای باس نابن. چونكە لەو بوارەدا تێكۆشان ئەنجامدراوە و سەركەوتووە.

ئەمە بۆ نەتەوەپەرستی سەرەتایی یش بە هەمان شێوەیە. وەك دەزانین نەتەوەپەرستی سەرەتایی كە بە شكڵی PDK دەسەپینرێت، لەگەڵ MIT (دەزگای هەواڵگری تورك) یەكیان گرتووە. لە ساڵانی ١٩٧٠ كانەوە لە رێگای هەندێك كۆمەڵەی كوردیەوە ویستیان بیسەپێنن. لە رێگای چەندین گرۆپی كوردی جیاوازەوە ویستیان نەتەوەپەرەستی سەرەتایی بسەپێنن. هەموومان ئاگادارین كە

هێشـتاش داگیرکـاری تـورک بـە دەسـتی چینـی دەسـەڵاتـداری کـورد دەیـەوێت نەتەوەپەرسـتیەکی بـەکرێگیراو زاڵ بکـات. بـەڵام نەتەوەپەرسـتی سـەرەتایی لـە شۆڕشـی کوردسـتاندا تەشـهیرو گۆشـەگیر کـراوە. ٢٠ سـاڵە تێکۆشـانێکی زۆر بەرفراوان لە بەرامبەریان ئەنجامدراوە. چەندین فراکسیۆن و لقی جۆراوجۆریان ئاواکران، بەڵام جارێکی تر هێزی هەرە بنەڕەتییان بارزانی- تالەبانی بوون.

گرووپی رێگـای ئـازادی کـە پشـتی خـۆی بـە بـارزانی سـپاردووە، لـە ڕۆژی ئەمرۆماندا ناوی پارتی سۆسیالیستی لە خۆی ناوە. لە ژێر نـاوی وەک رزگـاری، ئاڵای رزگاری، KDP, KUK, KAWA، و نـاوی هاوشـێوەی ئەمانـەوە داگیرکـاری ویستی خۆی بەکاریگەر بکات، بەڵام ریشـەی سـەرەکی ئەوانە بۆ هێزە دەرەبـەگ- خێڵەکیـەکان دەگـەڕایـەوە، ئـەوانیش گرێـدراوی نەتەوەپەرستی تـورک بـوون، بـە تایبەتیش پەیوەندیان لەگەڵ MIT ی تورکی هەبوو. ئەوانە هـەموویان بـە یەکـەوەو بە هەمئاهەنگی ویستیان پەرەسەندنی نیشتمانپەروەری بە پڕەنسیپ و وڵاتپارێزی شۆڕشـگێرانە بخنکێنن و لـەناوی ببـەن. پارتەکـەمان PKK لـە بەرامبـەر ئەوانـەش تێکۆشانێکی بە پڕەنسیپانەی بەرێوە برد. ئیتر لە ناوەڕاستی ١٩٧٠ کان بە ئاسـانی توانیمان گەل رۆشن بکەینەوەو ئەوانە گۆشەگیر بکەین.

بە کورتاسی تێکۆشانێکی دوو لایەنە بەرێوە چوو. لەو تێکۆشانە دوو لایەنەدا هـەم نەتەوەپەرستی تـورک و هـەم نەتەوەپەرسـتی سـەرەتایی کـورد لـەناو گـەلی کوردستان تا رادەیەکی بەرچاو تەشهیر و گۆشەگیر کران.

وەک دەزانرێـت بـاڵابوونی ئایـدیۆلۆژی PKK لـە ئـەنجامی ئـەو تێکۆشـانە بەدیهات. لـە هەمانکاتـدا ئاراسـتەگرتنی PKK بـەرەو رێچکـەیـەکی سیاسـی بـە هێـز لەسـەر بنەمای سـەرکەوتنی ئەو تێکۆشانە ئایدیۆلۆژیە بـوو. لـەو سـۆنگەوە؛ کاتێک لـە دوای ١٩٨٠ هەوڵـەکانمان لـەپێناو کرانـەوەی گـەریلا بـەرەو لایـەنی سـەربازی دەستی پێکرد، لایەنی بەرامبەرمان شێوە جیاوازەکانی نەتەوەپەرستی تورک ئینجا سۆسـیال شـۆڤینیزم بێـت، یـان نەتەوەپەرسـتی سـەرەتایی بێـت، وەڵامـی خۆیـان وەرگرتبوو و دەرباز کرابوون و بەو شێوازە هـەنگاومان نایـە نـاو ئـەو قۆناخـەوە. قـەڵـەمبازی ١٥ ی ئاب(دەسـتپێکردنی تێکۆشـانی چەکـداری لەسـاڵی ١٩٨٦) لـە ئەنجامی سەرکەوتنی سیاسی و ئایدیۆلۆژی رێبازەکەمان لەبەرامبەر ئەو رەوتانە بەدیهات. بێ گومان ئەو هەنگاوە مێژووییە لە هەمانکاتدا بەرهەمی گەلێک هـەوڵ و رەنجی دیکەشـە، بـەڵام بـە بێ دەسـتەبەر کردنـی ئـەو سـەرکەوتنە ئایدیۆلۆژیـە،

گەیشتنمان بە قەڵەمبازی ١٥ی ئاب بیری لی نەدەکرایەوە. واتە سەرکەوتنی ڕێبازی ئایدیۆلۆژی – سیاسی دەرفەتی کرانەوەی سەربازی دروست کرد. لەسەر ئەو بنەمایە بە گەیشتن بە ساڵانی ١٩٩٠ شەڕ و تێکۆشان بوو بە نموونەی هەرە بەرچاو و هەڵبژاردەی سۆسیالیزمی ئافرێنەر.

ئەمەس بوو بە نموونەیەکی هەڵبژێردراوی سۆسیالیزمی ئافرێنەر کە تا رادەیەکی زۆر هەم کاریگەری لەسەر باشووری کوردستان دروست کرد و لەسەر هەرێمیش کاریگە بوو، هەروەها بوو بە پەرەسەندنێک کە سەرجەم گروپە نەتەوەپەرستیە سەرەتاییەکان و کۆڵەکەکانیان واتە نەتەوەپەرستی بورژوازییان تێکشکاندو تەخت کرد. هەروەها قەڵەمبازی ١٥ ی ئاب گروپە سۆسیال- شۆڤینیەکان، بە تایبەتیش ئەو گروپە سۆسیال- شۆڤینیانەی تێکشکاند وتەختی کردن کە لە تورکیا خۆیان بە نەتەوەپەرەستی تورک گرێدابوو و خۆیان پێ سپاردبوو.

کاتێک هیچ رەقیبێک لەبەرامبەر نەتەوەپەرستی بورژوای تورک نەمایەوە، پێویستی بە ئامرازێکی نوێی هێرش کردن دەبێت. بەڵام سەرجەم چەکەکانی دەست نەتەوەپەرستی تورک یاخود رژێمە هەرە هۆڤانەکەی واتە بە دەست فاشیزمی ١٢ ی ئەیلول بێ رۆڵ مانەوە. بێگومان لەبەر ئەو هۆکارانە پێویستییان بە چەکێکی نوێی هێرشکردن هەبوو. لەسەر ئەو بنەمایە نەتەوەپەرستی بورژوای پەرە بە شەڕی تایبەت دەدات و گوڕی دەکات. بەتایبەتیش فاشیزمی ١٢ ی ئەیلول زۆربەی هێرشەکانی لەبەرە کراوەکاندا پەیڕەو کرد. رژیمی ١٢ ی ئەیلول هەستی بەوە کرد کە شەڕی تایبەت لە کوردستان تەنیا بە ئامرازی سەربازی شەڕی ڕووت بەس ناکات و پێویستی بە شێوەی ئایدیۆلۆژی- سیاسیش هەیە. لەلایەکی دیکەشەوە بە تایبەتی لەوە تێگەیشت کە PKK نەتەوەپەرستی سەرەتایی بێ رۆڵ و بێ کاریگەر کردووە. هەروەها ئەوەشی بینی کە چیتر گروپە سۆسیال- شۆڤینیەکانی ژێر دەمامکی سۆسیالیزمیش ناتوانن ریزەکان لێڵ و تەم و مژاوی بکەن. ئیدی بە باشی دەیزانی کە بەو چەکانە ناتوانێت لەبەرامبەر بە PKK شەڕ بکات یاخود لەمیانی خۆسپاردن بەوانەوە ناتوانێت لە شەڕی دژ بە رزگاری نیشیمانی کوردستان مەودا ببڕێت.

کەواتە چی لە دەستیدا مایەوە؟ دووبارە چەکە کۆنەکەی! جارێکی دیکە نۆرەی چەکی هێرشی هەزار ساڵەی هاتەوە! جارێکی تر وەکو چەکێکی هێرشی نوێی ئایدیۆلۆژی ئەوە بەکار دەهێنرێتەوە!.. بەردەوام بوونی رۆڵی نەرێنی

تایبەتمەندییە دواکەوتووە کانی گەلی کورد؛.. بە تایبەتیش لە ڕێگای مەزهەب و تەریقەتەکانەوە لەتکردن و پارچە کردنی گەلی کورد، هەروەها لەو ڕێگایەوە دوورخستنەوەی کۆمەڵگا لە پەرەسەندنی کۆمەلایەتی خەسڵەتی میللی؛ ئەمانە هەمووی چەکە کۆنەکەی نەتەوەپەرەستی تورکی وەبیر فاشیزمی ١٢ ی ئەیلول هێنایەوە، واتە ئایینی بەبیر هێنایەوە کە چەکی دەستی سەرجەم ڕژێمە دەسەلاتدارەکان و سوڵتانە تورکەکانە. بەڵێ ووتیان با جارێکی تر ئایین بەکار بهێنین. هەڵبەتە لەبەر ئەو هۆکارانە دەکرێت تەریقەتگەرایی تورگوت ئۆزال و ئایینگەرایی کەنعان ئەڤرەن مایەی تێگەیشتن بێت. لەم ڕێگایەوە دەیانەوێت پەلهاوێشتن و قەڵەمبازێک بۆ تورکایەتی ئەنجام بدەن. ئەوەش بە واتای خۆپێچاندن لەو چەکە ئایدیۆلۆژیە کۆنە دێت.

وەک دەزانین لە ئەنجامدا لە سەردەمی ١٢ ی ئەیلول پەیوەندیەکی نائاسایی بەرامبەر بە تەریقەتەکان پیشاندرا. پشتیوانی مادديان پێشکەش کرا. لەو بوارەوە بە تایبەتی پشتگیری لە عەرەبستانی سعودی وەرگیرا. ژمارەیەکی زۆر لە کەسایەتیە بە ناو ئایینیەکانیان بە مووچەوە گرێدران. وەکو دەبینرێت ناوەندی شارە کوردیەکانی وەک ئێلیح (باتمان) ئامەد (دیاربەکر)، روها (ئۆرفا) و سیلوان پڕ کران لە خانە و هێلانەی تەریقەتەکان. ئەو کارە چۆن ئەنجام دەدرێت؟ مندالانی (٧) سالان دەبرێن بۆ پانسیۆن(خەفگە) کان. بە شەو و ڕۆژ دۆگماکانیان پێ دەرخ دەکەن، بۆ نکوڵیکردنی راستینەی نەتەوەیی-کۆمەلایەتی خۆیان هەر چیەک پێویست بێت، ئەنجامی دەدەن. هیچ گەنج و منداڵێک ناهێڵنەوە کە خۆیانی پێ نەگەیەنن.

وەک چۆن لە سەردەمی عوسمانیەکان مندالانی ٧ ساڵەی مەسیحیان لە ڕێگای تایبەتەوە لە ماڵەکانی "یەنیچێری" بە زۆر دەکرد بە موسلمان و دەخرانە ژێر فەرمانی سوڵتانەکانەوە، لەم سەردەمەشدا سەرجەم منداڵە کوردەکان دەگرن و بە دەستی ئەو تەریقەتانە بەرامبەر بە راستینەی نەتەوەیی- کۆمەلایەتی خۆیان ناچاری خیانەتیان دەکەن و ئەو مندالانە وەکو خائینێک پێ دەگەیەنن . ئەو ڕێکارە پێشتریش لە دوای کۆمەڵکوژی دێرسیم ئەنجامدرابوو. ئەوکاتە کەمالیزم ئەو ڕێکارەی بە ئامانجی تورککردنێکی ساف و پوخت ئەنجامدا. سەرجەم مندالانی کۆکردەوە و بە پەروەردەیەکی زۆر باشی زمانی تورکیدا تێپەڕی کردن. ئەو مندالانەی لە دوای کۆمەڵکوژی دێرسیم لە چوارچێوەی جێبەجێ کردنی

ئامانجەکانیان لە یەنی چەریەکان کۆکرابووەنەوە، بە جۆرێک پەروەردە کران کە لە تورکێک زیاتر بەرگرییان لە تورکایەتی دەکرد و دەیانپارست. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا هەندێک لەوانە وەزیر و جەنەڕاڵن. تورکچیەکی تەواو عەیارن. بێگومان ئەمانە هەمووی دوای قڕکردن لە خوێندنگاکان وەک بەرهەمێکی ئاسمیلاسیۆن جێبەجێ کران.

هەڵبەتە لە رۆژی ئەمڕۆماندا تورکچێتیەکی ئەوپەڕگەری بەمجۆرە لە شوێنەکانی دیکە سەری نەدەگرت. بە تایبەتیش لە دەڤەرە بەرفراوانەکانی کوردستان، لەو شوێنانەی کە PKK زانستی نەتەوەیی تێدا بڵاو کردۆتەوە، وەک چۆن لە دێرسیم ئەنجامیاندا تورکچێتیەکی تەواو عەیار سەری نەدەگرت. کەواتە ئەو کارە چۆن دەکرا سەر بگرێ؟ ئەمجارەیان بە چەکی نەتەوەپەرستی تورک نەبوو، بیریان لە ریبازە کۆنەکانی ئیسلام کردەوە کە لە بواری راستینەی کۆمەڵایەتی- نەتەوەیی رۆڵێکی پێچەوانە دەگێڕێت، بە رێکاری تەریقەت و مەزهەبی چەواشەکراو ئامانجیان تواندنەوەی پاشماوەکان و بە شێوەیەکی جیاوازتر بە تورککردنیان و خستنە ژێر فەرمانی تورکایەتی بوو.

جارێکی تر خوێندنگای ئایینی جیاواز دەرکەوتوون و چەندین گۆڤار دەردەخەن. ناوی ئەو خوێندنگایانە گرنگ نییە. لەلایەکی دیکەوە مەسەلەی "حزبولا" هەیە کە رێکخستنێکی تاریک و نادیارە. گوایا لە ئیسلامیەتدا نەژاد پەرستی بوونی نییە، گوایا لە ئیسلامیەتدا جیاوازی نێوان نەتەوەکانیش بوونی نییە. لەوانەیە لای ئەوان نەتەوە هیچ واتایەکیشی نەبێت، بەلام پیویستە لەو بکوژانە و لەو شەمشەمەکوێرانە بپرسین: تۆ بە چ زمانێک هێرش دەکەی؟ تۆ بە چ کولتوورێکەوە هێرش دەکەی؟ پارەی تۆ لە کوێوە دێت؟ ژیانی تۆ چۆن و لە کوێوە رێکخستن دەکرێت؟ لە چوارچێوەی کام نەتەوەوە سەرجەم ئەوانە دابین دەکەی؟ بەو شەڕانگێزیەوە، بە مووچەکەتەوە، بەو ژیانە کۆمەڵایەتی و کولتووریەتەوە، بەو زمانە و راستیەکانی دیکەتەوە جێگای خۆت لە چوارچێوەی کام نەتەوەدا دەگری؟ پاشان هەڵدەستی و باسی نەژادپەرستی دەکەیت! نەژادپەرستی هەرە مەزن تۆ ئەنجامی دەدەی!.

بەڵێ، رووبەڕووی نەژادپەرستیەک بووینەتەوە زۆر لە سۆسیال- شۆڤینیزم مەزنترە، لە نەژادپەرستی فاشیزمی هیتلەریش چاو سوورترە. سەردەمێک لە ڕوسیا نەژادپەرستی "ڕوورەشەکان" هەبوو. بە تەواوەتی نەژادپەرستی ڕووڕەشانەی حزبولاش دەسەلمێنین، مسۆگەر راستیەکانیان دەخەینەڕوو.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە لە نێوان تەریقەتەکانیشدا هەندێکیان خەسڵەتی هاوشێوەی ڕووڕەشەکان یان هەیە و ئەوانەش ڕێکخستنی نەژادپەرستی تورکن. چونکە ڕێبازی نکوڵیکردنی نەتەوەیی لای ئەمانەش زۆر کوێرانەیە. دۆخی ئەوانە هاوشێوەی ڕۆشنبیرانی کەمالیست نییە. بۆ نموونە ڕۆشنبیری کەمالیست شۆڤینستە، بەڵام ئاستێکی وشیارییان هەیە. ئیلهان سەلجوق یش کەمالیستە، بەڵام بە تەواوەتی نکوڵی کردن لە کوردان بە پێویست نابینێت. بەڵام با سەیرێکی ئەو تەریقەتانە بکەین؛ سەیری شۆڤینیستە تەریقەتچیەکان بکەین: تەواو عەیار تورکچین. یەکە بە یەکەیان تورکچیەکی هارن، تەنانەت ناوی کوردیش ناهێنن، بە شێوەیەکی زۆرکوێرانە تورکایەتی دەکەن: بە تایبەتیش بیبیێ ئەوەی باسی ئەو وشەیە بکەن تورکایەتی دەکەن. کاتێک باس لە کورد دەکرێت، دەڵێن ئەوە نەژادپەرستییە. بە بێ ڕەچاوکردنی هیچ ڕێسا وپێوانێک دەدەن بەسەر دادگا. بەڵێ ئەوەیە نەژادپەرستی کوێرانە.

کەواتە لە جیاتی ئەوەی بەو تەریقەتانە بووترێت تەریقەتی ئیسلامی، پێویستە بوترێت ڕێکخستنە ڕووڕەشەکانی شۆڤینستی تورک، کە دەمامکی ئیسلامیان پۆشیوە، کوێرن و ڕووڕەشن یاخود خۆیان ڕەش و تاریکن. بە ڕاستیش بەمجۆرەن. ئایا فاشیزمی ١٢ ی ئەیلول ئەو ڕژێمە نییە کە گیان-خوێن و پارەی بەو تەریقەتانە دەدا؟ بەڵێ! ئەوەی ئەوانی ڕێکخست ئەو ڕژێمە نەبوو؟ بەڵێ! ئەو کاتە ئایا سەرچاوەی پارەی نەقشبەندیەکان، سولەیمانچیەکان و نورچیەکان دیار و ئاشکرا نییە؟ ئایا سەرچاوەی پارەی هەموو ئەمانە ئەو ڕژێمە یاخود هێزە تاریکەکان نییە؟ ئەگەر تورکەکان بن، عەرەبەکان بن، یان فارس و ئێرانیەکان، یاخود چوزانم چەپڕەوەکان بن یان هەر هیزێکی دیکە، لە چوارچێوەی چ ئامانجێک ئەو پارەیە دەدەن؟ ئایا زۆر لایەنگری دادپەروەرین؟.

ئەشکەنجەدراوێکی زۆر لە ئارادان، وڵاتێک کراوە بە وێرانە؛ ژینۆسایدکردنی زمان، ئایین و کولتووری گەلێک، لە ناوبردنی هەر جۆرە نرخ و بەهایەکی لە ئارادایە. ئەی بۆچی پارە بۆ ئەمە نییە؟ ئەی بۆچی هاوکاری بۆ ئەمە نییە، ئەی بۆچی هێندە پارە بۆ نکوڵیکارانی نەتەوە و خائینان هەیە؟ بە زمانی عەرەبی سەروەری هەرە مەزن دەنوێنی، بە زمانی فارسی بە هەمان شێوە سەروەری هەرە مەزن دەنوێنی، بە زمانی تورکیشەوە نەتەوەپەرستی دەکەیت؛ بە تایبەتمەندی هەرە بەهێزی نەتەوەییەوە هەموو شتێک بۆ خۆت مافدار دەبینی و

ئەوەش وەکو ئامرازێکی پێشکەوتن دەژی. بەڵام کاتێک کوردایەتی دەبێتە مژاری باس، ئەوە دەبێت بە نەژادپەرستی! بەکارهێنانی ئەو بابەتە تا رادەیەکیش بەمجۆرە پێشدەکەوێت و رژێمی ١٢ ی ئەیلولیش لەو مژارەدا هەنگاوێکی دیکە بەرەو پێشەوە چووە. ئۆزال و ئەڤرەن خۆیان پێشەنگایەتی ئەو هەنگاوەیان کرد، تەریقەتەکانیان زەقکردەوە و خستیانە مەیدانەکانەوە. رێژەیەکی زۆری تەریقەتگەرا و پیری ساختەیان هێنا مەیدانەکانەوە. ئەو رێکارە نەک تەنیا بۆ سونیگەراکان، بە هەمان شێوە بۆ عەلەویەکانیش پەیڕەو کراوە. چەندین پیر و دەدەی ساختەی عەلەوی و کۆمەڵەکانیان و ژمارەیەکی زۆر لە تەریقەتی نەقشبەندی سونیگەرا لەلایەن خودی ئەوانەوە رێکخران. ئەوانە لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات رێکخران. هاوکات ئەوەی هەموویان بە ئاشکرایی باسیان لێوە دەکرد بە کورتاسی بەمجۆرەیە: بە ئامانجی سەرکوتکردن و داپڵۆساندنی هەڵمەتی رزگاری نەتەوەیی PKK با لە باشوور تەریقەتی نەقشبەندی و لە باکووریش عەلەوێتی رێکخستن بکەین. ئەگەر لە باشوور نەمانتوانی دایببڕین، لە باکوور دایببڕین؛ ئەگەر لە باکوور نەمانتوانی ئاستەنگی بکەین، لە باشوور ئاستەنگی بکەین. تەنانەت سەبارەت بەو مژارە وەزیری تایبەتیشیان ئەرکدار کرد. لەسەردەمی ئۆزاڵدا پەیڕەوکاری هەرە گەورەی نەقشبەندێتی لە کوردستان عەبدولقادر ئاکسوی و سولالەکەی بوو. کردیان بە وەزیری ناوخۆ. ئەمڕۆش کەسێکیان بە ناوی محەمەد مۆغولتای کردووە بە وەزیر کە سەر بە سۆسیال دیموکراتەکانە و بە رەچەڵەک خەڵکی دێرسیمە. کەسێکی سۆسیال- دیموکرات لە جەوهەردا کەسێکە کە لەپێناو ماف-حقوقی رەنجدەران هەوڵدەدات، بەڵام محەمەد مۆغولتای بەو ئامانجە کرا بە وەزیر تا پێشخستنی لەسەرەتا لە ئەستەنبوڵ و ئەنادۆڵ پەرە بە کاریگەریەکانی عەلوێتی ساختە بدات، واتە بە ئامانجی قۆستنەوە و بەکارهێنانی عەلەویەکانی ریزی رەنجدەران ئەم ئەرکەیان پێداوە. لە ئاستی هەرە سەرەوە تا هەرە خوارەوە گەلێک تۆڕی هاوشێوەی ئەمە خرایە جوڵەوە. بەو ئامانجەی شۆڤینیزم بەسەر تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی و دیموکراتیزەبووندا زاڵ بکەن ئەوەی لەدەستیان هاتووە دەیکەن. بەڵام لە سەردەمی ١٢ ی ئەیلول کاتێک ئەمانەیان بە ئاشکراییش ئەنجام دەدا و پەیڕەویان دەکرد، ئێمە ئەوانەمان زۆر بە جددی وەرنەدەگرت. ئەو تەریقەت و عەلەوێتیەی لە زمانی ئەواندایە دەبێ بە چی؟

ئەگەر عەلەوێتی جەوهەرێکی شۆڕشگێری هەبێت، ئەوا بە باشترین شێوە ئێمە نوێنەرایەتی ئەو جەوهەرە دەکەین؛ ئەگەر ئیسلام جەوهەرێکی شۆڕشگێری

هەبێت، ئەوا بە باشترین شێوە ئێمە نوێنەرایەتی دەکەین. تەنانەت دوو وشەش لە ئارادا نییە کە هیچ یەکێک لە تەریقەت و مەزهەبەکان بیڵێن. لەبەر ئەوەی ئەو تەریقەت و مەزهەبانە پشتیان لە گەلی کورد کردووە و بە تەنیایان هێشتوتەوە؛ ئەوان لەو مژارەدا ناتوانن بەرگری لە دوو وشەش بکەن. تەنانەت ئەندامە هەژارەکانی ئەو مەزهەب و تەریقەتانەیان بەرەو هەڵومەرجی هەرە دژوار ئاراستە و پەروەردە کردووە. لەو سۆنگەوە؛ دوو وشەیان نییە بە ئەوانیشی بڵێن. هەر لەسەرەتاوە ئەوە بانگەشەکەمان بوو و بە بێ درێژکردنەوەی قسەکانمان لەسەر ئەو بنەمایە بەسەریاندا دەچووین. لەبەر ئەو هۆکارەش بوو مرۆڤی سەر بە هەر تەریقەت و مەزهەبێکەوە، ئەوانەی چەواشە نەکراون و بە سیستەمەوە گرێ نەدراون بە خێرایی توانیمان بەرەو ریزەکانمان رایانبکێشین و لەو چوارچێوەیەدا رووبەرووی زۆر زەحمەتی جددی نەبووینەوە.

بە تایبەتی ئەو دۆخە تا سالانی ١٩٩٠ بەو جۆرە پەرەی سەند و بەردەوام بوو. لەگەڵ بەرفراوانبوونی سەرهەڵدانەکانی گەل و پەرەسەندنی زیاتری گەریلا لە دوای ١٩٩٠ کان دۆخەکەش گۆڕانی بەسەردا هات. ئیتر تەواوی کوردستان بە شێوەیەکی گشتی دەبوو بە مەیدانی حاکمیەتی PKK .

ئەوانە ئەمەیان بینی؛ سەدان ساڵە تا رادەیەکی زۆر گەلیان هەڵخەڵەتاندوە، بە ناوی ئایین، مەزهەب، سوڵتانیەت، بە ناوی کۆمار و تەریقەت بەرژەوەندیەکی مەزنیان دەستەبەر کردووە. ژمارەیەک لە شێخەکانی نەقشبەندی تا ئێرە هاتن. پێکهاتەیەکی وەهایان ئاواکردووە هەندێکیان دەڵێن سەد هەزار ئەندامامان هەیە. ئەو برە پارەیەی لە هەر ئەندامێکی وەردەگرن، کۆی گشتیەکەی دەگاتە چەندین ملیار. بەڵێ، چەند پەرلەمانتار و چەند وەزیرێکیان هەیە. لە راستیدا بە مانایەک لە ماناکان بە شێوەیەکی فەرمی ئەوە هاوبەشێتییە لەگەڵ دەوڵەتدا. لە دۆخی هەڵوێست وەرگرتن لەبەرامبەریان، ئەوانەیان لەدەست دەچێت، لەبەر ئەو هۆکارەشە تەنگەتاو بوونە و نازانن چی بکەن.

لەلایەکی دیکەوە عەلەویگەرایش ئەوروپا دەپێچێتەوە. بەرژەوەندی ژمارەیەکی زۆر لە سەید، پیر و دەدە بەهۆی هەڵوێستی دژ دەهەژن. ئەو لێشاوە بە هاوکاری دەوڵەت تا ئەو شوێنانە دەگوازرێنەوە. هێشتا هەژمارێکی زۆری دیکەی تەریقەت هەیە. هەر دەڤەر و هەرێمێک دەخرێتە ژێر کاریگەری تەریقەتێک. کۆمەڵێک خەڵکیان لە دەوروبەری خۆیان کۆکردۆتەوە، ژەهر و ئافیۆنیان دەرخوارد دەدەن،

ئەوەش لە کاتێکدایە کە ئەوانەی بەکاری دێنن نازانن بۆچی دەیخۆنەوە. گوایا دەڵێن: ئەوەی دەیخۆنەوە خواردنەوەی بەهەشتە؛ هێزە دەسەڵاتدارەکان بەو شێوەیە ئەو مرۆڤە بێ هۆش، سەرخۆش و سڕ بووانە بە تەواوەتی دەخەنە دۆخێکەوە کە نەناسرێنەوە. تەنانەت ئاوی هەرە پیسی گەرماویان دەرخوارد دەدەن. ئەوەش بە ناوی کەرامەت و موتفەڕکی شێخەوە ئەنجام دەدرێت! بەڵێ بەرەو ئەو ئاستەی ریسوایی و رەزالەتیان دەبەن.

وەک باسمان کرد تەنانەت یەک منداڵیش لە دەستیان رزگاری نەبووە. بە جۆرێک ئەو منداڵانەیان کوێر کردووە، کەسایەتی هەرە فەناتیک یان لێ دروست بووە. دوای ئەنجامدانی سەرجەم ئەوانە رژێم پێویستی بە شاڵاوێکی نوێ بینی، بەمجۆرە خەنجەرێکی دیکەی لە دڵی مرۆڤەکاندا.

لە راستیدا شۆڕشی ئێرانیش شۆڕشێکی دوای١٩٨٠ بوو. لە بنەڕەتدا ئێران هەندێک لە تایبەتمەندیەکانی ئیسلامیەتی لە دژی دەسەڵاتی بیانی بەکار هێناو هەڵوێستێکی پیشاندا. لەم رێگایەشەوە ویستی رۆڵی نوێنەرایەتیکردنی چەوساوەکان ببینێت. ئێران بەو هەڵوێستەیەوە شۆڕشی ئەنجامدا. بە شۆڕشەکەی تا رادەیەکی زۆر کاریگەری لەسەر رۆژهەڵاتی ناوینیش دروست کرد؛ کاریگەری لەسەر تورکیاش کرد. لە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ تورکیا لایەنی ناکۆکی بەرچاوترە. تا قۆناخی ساڵانیی ١٩٩٠ کان لە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئۆزاڵ ناکۆکیەکی زۆریان هەبوو، بە ئاستێک گەیشت نوێنەرانی ئێران ووتیان" ناچینە زیارەتگای ئەتاتورک، سەردانی مەولانا دەکەین" و ئەوەشیان ئەنجامدا. لە ئاستی سەرۆک وەزیراندا ئەوکارەیان ئەنجامدا. تورکیاش ناچار بوو ئەو هەڵسوکەوتە قەبوڵ بکات. وەک دیار دەبێت کە بەو تەعویزدانەیان لەبەرامبەر ئێران، حیسابی وردە وردەی بەکارهێنانی هەندێک شێخی لە کوردستان کردووە.

لەوانەیە ویستوویەتی بڵێت؛ "رزگاری نەتەوەیی کوردان بۆ هەردووکمان مەترسیدارە. شۆڕشی ئیسلامی لە دژی کەمالیزم و نەتەوەپەرستی تورکە، بەڵام ئەگەر تێکۆشانی رزگاری نەتەوەیی کورد لە کوردستان مەزن ببێت، بۆ ئێرانیش مەترسیدار دەبێت. ئەو مەترسییە نەک تەنیا بۆ ئێمە، بۆ ئێوەش مەترسییە".

تورکیاش بە عەرەبەکان دەڵێت" رزگاری نەتەوەیی کورد بە پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانی هەموومانە". نوێنەرایەتی کۆماری تورک کاتێک هاتنە سوریاش ئەمەیان ووت. تورکیا لەو مژارەدا لەگەڵ ئێراق بە بەردەوامی لە نێو هاوپەیمانیدایە.

کۆماری تورکیا لە پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ ئێران؛ لەگەڵ ئەنجامگیربوونی شۆڕشی ئێران هەوڵیداوە رەوشێکی گوماناوی دروست بکات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئێران هێزێکی شۆڕشگێری بوو، PKK ی بینی و هەوڵی هەندێک پەیوەندیدا. ئێران بە بینینی ئامادەبوونی رژێمی تورک بۆ تەعویزدان دەستبەجێ زیاتر بەلای خۆیدا کێشا. دەوڵەتی تورک لە واتای سیاسیدا مۆڵەتی ئەوەیدا نوێنەرانی ئێران سەردانی گۆڕی مەولانای مەزهەبگەرا و فەیلەسوفی هەرە مەزنی ئێران لە قۆنیا بکەن. کۆماری تورکیا بە ووتنی" دەتوانن سەردانی زیارەتگای ئەتاتورک نەکەن، دەتوانن کەمالیزم پەسەند نەکەن"، یەک لە دوای یەک تەعویزی بە ئێراندا. تەنانەت ئەو دۆخە لە تورکیا ریگای لەبەردەم گفتوگۆیەکی مەزن کردەوە.

دوای تێپەڕبوونی ماوەیەکی دیار بەسەر ئەو پەیوەندی و ناکۆکیانەدا، بە تایبەتیش کاتێک کاریگەری لەسەر بەرژەوەندی ئەو شێخ، ئاغا و سەرۆک عەشیرەتانەی کوردستان کرد کە بە درێژایی مێژوو بەکرێگیراوییان کردووە؛ بەمجۆرەش ئیترکاریگەریەکەیان سنووردار دەبوو و گورزیان بەردەکەوت لە ناوەڕاست دەمانەوە، کۆماری تورک کەوتە ناو هەوڵدان و هەنگاوی نوێوە. ئەو لایەن و دەوروبەرانە لە رابردووشدا بەکرێگیروی رژێمە داگیرکەرەکان بوون، خزمەتکار و ئەڵقە لەگوێی رژێمەکان بوون. بە تەئکیدەوە تەنگەتاو ببوون و بۆ پاراستن بە دوای چارەیەکدا دەگەڕان. وەک دەزانرێت بەو ئامانجەی دواتر باجی خیانەتەکەیان بە قورسی نەدەن، نزیکی تەریقەتەکان دەبنەوە و خۆیانیان پێوە هەڵدەواسن. چارەسەرییان بە خۆ نزیککردنەوە و خۆپێچان لە ئاییندا بینیوە. خۆی لە خۆیدا سەدان ساڵ بوو ئەو چەکەیان بەکار دەهێنا. ئەو بەکرێگیراوانە کاتێک هاتنە وڵاتە عەرەبیەکان، بە رژێمی سوریایان ووت "ئێمە نوێنەرایەتی عەرەبایەتیمان کرد". ئێستاش دەچنە ئێراق، باسی نرخ و بەها مێژووییەکانی ئێران دەکەن. چونکە رێژەیەکی زۆری ئازەری لە ئێران هەیە. هەروەها شیعەتی هەیە. لەسەر ئەو بنەمایە بە هەزاران خوێندکاریان رێکخست و رەوانەی ئێرانیان کردن. بەڵام لەبنەڕەتدا زۆرینەی ئەوانەی رەوانە کرابوون سەر بە پۆلیس بوون. گوایا لە باکوورەوە رێژەیەکی زۆری کەسانی عەلەوی بۆ مەزهەبی شیعە دەنێرن. بە کورتاسی خەباتێکی رێکخستنیان بەرێوەبرد. لە باشووریش نەقشبەندیەکانیان رێکخست. دوای ئەوەی بەرژەوەندییە ماددییەکانیان گورزی بەرکەوت تەڤگەری هاوبەشیان دەستی بە جووڵە کرد. لە راستیدا ئەو رەوشە زۆر گرنگە.

رۆژانە هەواڵی نوێ دەبیسین؛ دەڵێن" PKK داوای هێندە چەک و پارەمان لێ دەکات، پێیان نادەین". دواتر دەستبەجێ پەیوەندی ئەوانە بە ئایینگەرایی و حزبولاّچیەکانەوە دیار و ئاشکرا دەبێت. ئەوە وەک گەرەنتی و ئامرازێکی نوێی خۆ پاراستن دەبینن و تاوتوێ دەکەن. بەمجۆرە پێویستی پاراستنی ئەو بەرژەوەندییە قیزەوەنە دەبینن. ئەو مژارە چەندین جار شی کراوەتەوە و هەڵسەنگێندراوە.

بێگومان شۆڕشی ئیسلامی ئێران دەیەوێت پێگەی ئایدیۆلۆژیکی خۆی درێژە پێبدات. بە رادەیەکی سنوورداریش بێت، دژە ئیمپریالیستیەک لە گەلی ئێراندا بەدی دەکرێ. هێشتا دەخوازێ شۆڕشی خۆی بەرفراوان بکات و بڵاوی بکاتەوە. لە راستیدا ئەو هەوڵدانە لایەنی ئەرێنی و لایەنی نەرێنیشی هەیە، بەڵام وێڕای ئەمانە لە کاتێکدا شۆڕشی ئیسلامی وەکو ئامرازێکی گونجاو بە نەریتە میللییەکانی لە پەرەسەندنی میللی و پێشخستنی مەزهەبی خۆی بەکاردێنێت، پەرەسەندنی میللی سەرجەم نەتەوەکانی دیکە پشت گوێ دەخات، لەسەرووی هەمووشیانەوە هی گەلی کورد. لەبەر ئەوەی زۆرینەی کوردان سوننە مەزهەبن، شیعەگەرێتی زیاتر وەکو هێزێکی گوشار و سەرکوتکردن بەکار دەهێنرێت. لەبەر ئەو هۆکارەش ناکۆکییەک لە ئارادایە. نەتەوەپەرەستی تورک دەخوازێ ئەو ناکۆکییە بە تایبەتی لە دژی PKK بەکار بهێنیت. دەکرێ بووترێت بەڵگەگەلێکی ئەوتۆ لەبەردەستدا نییە کە شێوازی بەکارهێنان یاخود چۆنیەتی بەکارهێنانەکەی روون بکاتەوە. بەڵام ئەوە روون و ئاشکرایە کە باڵێکی حزبولاّچیەتی دەیەوێت خۆی بە ئێرانەوە بسپێرێت. بەڵام راست نابێت ئەگەر بڵێین بە تەواوەتی گرێدراوی ئێرانە. لەبنەڕەتدا لەو راستیانەی لە ماوەی چەند ساڵی دواییدا دەرکەوتن دەبینرێت کە حزبولاّچییەتی لەگەڵ ناوەندی گشتی پۆلیس، ناوەندەکانی تەریقەتە هەرێمیەکان و لەسەرووی هەمووشیان لەگەڵ بەرێوەبەری رەوشی نائاسایی لە پەیوەندیدایە. بە کورتاسی دەبینین کە گرێدراوی دامودەزگا ئەمنییەکان و دامەزراوەکانی دیکەی رژێمی داگیرکەری تورکە. لەوانەیە وەکو ئامرازێکی پەلهاوێشتنی ئایدیۆلۆژی ئێرانیش ویستبێتی کاریگەری خۆی بەکار بهێنێت. لەوانەیە ویستبێتیان ئێران بەکار بهێنن. لەو مژارەدا پێویستی بە روون کردنەوەی زیاتری راستیەکان هەیە. گرێدانی و پەیوەندی حزبولاّچیەتی لەگەڵ دەوروبەرە بەکرێگیراوە خۆجێییەکان زۆر روون و بەرجەستەیە.

پێناسەی هەرە واقیعی بۆ حزبوڵاچیەتی ئەمەیە؛ پێکهاتە یاخود رێکخراوێکی نوێیە کە دوای نەمانی کاریگەری میلیگەرایی تورک و سۆسیال شۆڤینیزمی دەمامکدراو بە کۆمۆنیزم، هەروەها بەهۆی شلەژانی بەرژەوەندیەکانی چینی دەسەڵاتداری کوردی نۆکەر و بەکرێگیراوی چینە دەسەڵاتدارەکانی بێگانە؛ بۆیە خواستیان تەریقەتگەرایی و مەزهەبگەرایی وەک چەکێکی نوێی هیرشی ئایدیۆلۆژی بەکار بێنن: لەسەر بنەمای دوژمنایەتی PKK و بەشێوەی هێزێکی بکوژ چەکدار کراوە و دەیانەوێت بەکرێگیراو و کۆڵەکە کۆنەکانیشیان رۆڵی بنکە کۆمەڵایەتیەکەیان ببینن.

بەڵێ دیاردەیەکە کە دەکرێت وەک پێکهاتەیەکی بەمجۆرە شرۆڤەی بکەین. بەڵێ لەسەر ئەو بنەمایە مێژووییە لەوانەیە ویستبێتیان ئێران بەکار بهێنرێت.

هەرچی کوردە بەکرێگیراوەکانیشن کە بەهۆی PKK ـەوە خۆیان زەرەرمەند دەبینن یاخود وەکو دوژمنی چینایەتی خۆیانی دەبینن و بگرە لەلایەنی نەتەوەییەوە نۆکەرایەتی نەتەوەی سەردەست دەکەن، ئەو توێژانەن کە لە نەتەوەی زاڵ زیاتر بە شان و باڵی نەتەوەپەرستی دەسەڵاتدا هەڵدەدەن. هەوڵێکی کۆنتڕایی شەڕی تایبەتە کە لەو دوو ساڵەی دوایی بەڕێوەبەرایەتی ڕەوشی نائاسایی بە شێوەیەکی تایبەت ئاوایکردووە و دوا هیوای بەرژەوەندی ناوەندە دەسەڵاتدارە بەکرێگیراوەکانن کە خیانەتیان لە کوردایەتی کردووە. بەڵێ هەوڵدان و پەلامارێکی کۆنترا(دژە گەریلا) یە. هیچ گومانێکی تێدا نییە لەناو حزبوڵاش کەسانێک هەن کە لە ناخەوە دەڵێن "من موسلمانم". لەوانەیە کەسانیک هەبن بڕوایان بە شۆڕشی موسلمانێتی کردووە. کەسانێک هەبن بە راستیش داخوازی شۆڕشی ئیسلامی دەکەن. هەر وەکو لەناو TKP ـەشدا کۆمۆنیستی راستەقینە و باوەڕمەند هەبوون. کەسێک بەناوی "حیکمەت قفلجملی" لە پارتی کۆمۆنیستی بە ناوی TKP دا بوو. ناوبراو لە ساڵانی ١٩٣٠ نووسینی سەبارەت بە کوردستان هەبوو. بەڵام ئەو دۆخە دەگمەنە، نەیتوانی رێگری لە ناوەڕۆکی سۆسیال- شۆڤینی TKP بکات. کەواتە هەبوونی یەکە یەکەی موسلمانی باش و راستگۆ شتێک ناگۆڕێت؛ حزبوڵا ئامرازێکە و لە ژێر فەرمانی رێکخستنی شەڕی تایبەت کاردەکات.

ئێستاکە هەندێک لە حزبوڵاچیەکان دەڵێن گەلۆ دەکرێت هێندە بێ مافی لەبەرامبەرماندا بکرێت؟ دەکرێ هێندە بە هەڵە شرۆڤە بکرێین؟ لەبەر ئەوەی هەندێکیش لە واقیع و رەوشی بابەتی دوورن ئەمانەیان پێدەڵێین؛ داوەری و

هزرێکی زۆر خەیاڵاوی، شێواو و چەواشەکراوتان هەیە. چونکە ئەو پێگەیەی تێیدان، دەیگشتێنن. هەتا لە نێو ئێمەشدا ژمارەیەک کەسایەتی لەمجۆرە هەن. پێویستە بەو کەسانە بووترێت: ئایا مێژووی ئایین دەزانی؟ پەیوەندی ئایین بە نەتەوایەتیەوە دەزانی؟ ئایا دەزانی سەبارەت بە کوردایەتیەوە ئایین چۆن بەکارهێنراوە؟ ئایا دەزانی راستینەی مەزهەب و تەریقەت لای کوردان چییە؟ ئایا دەزانی پەیوەندی رژێم و دەوڵەت بە ئایینەوە چییە؟ پەیوەندی بە راستینەی نەتەوەی دەسەڵاتدار و داگیرکاریەوە چییە؟ خودی جەوهەری شۆڕشگێری ئیسلام دەزانی؟ دوای وەڵامدانەوەی سەرجەم ئەو پرسیارانە، موسلمانە راستگۆکان دەتوانن وەڵامی نزیک لە راستی بدۆزنەوە. ئەو کاتە لەوە تێدەگەن کە بوونەتە ئامرازی چی و بە چ شێوەیەک بەکارهێنراون.

پێویستە لەبیری نەکەین، ئەوانەی وەکو هێرشبەر و بکوژ بەکاردەهێنرێن منداڵن. وەک باس دەکەن لەو ماوەی دواییدا سەرجەم ئەوانەی لە پشتەوە گوللەباران کراون تەمەنیان لە نێوان ١٥-٢٠ساڵاندان. بە تەئکیدەوە مێشکیان شۆردراوەتەوە. مسۆگەر مژدەی بەهەشتیان پێدراوە. گیرفانەکانیشیان پڕ دۆلار کراوە. ئایا مومکینە لەو تەمەنەیاندا فێری بنەما و بنەڕەتەکانی موسلمانێتی ببن؟ لەو چوارچێوەی باسمان کرد، منداڵێکی تەمەن ١٥-٢٠ ساڵان لە کوێ فێری موسلمانێتی دەبێت؟ ئەو منداڵە، نەدار، بێ هێز و بێ کارە. لە کوردستان بێ کاریەکی مەزن هەیە. خودی دەوڵەت رایگەیاند کە " ١٥ هەزار کەس دادەمەزرێنین". بەڵێ ئەوە کارەکەیەتی! ئەمەش ئەو کارەیە کە بە کەسانی بەڕەلا و بێ کاری داوە! بەڵێ ئەو توێژانەن کە کاری پێداون!

تەنها بۆ دروست کردنی هێزێکی هێرشبەر و بکوژ، تەنیا بە جۆرێک باسی موسلمانێتی کراوە و پێیان گوتراوە: " ئەگەر بکوژێت موجاهیدی، بمری شەهیدیت، بەهەشت چاوەڕوانیت دەکات" و "لە دونیاشدا پارە چاوەروانیت دەکات". کابرا سەیر دەکات، ئەگەر بمرێ شوێنەکەی باشە، لە دونیاشدا بمێنێ شوێنەکەی باشە. لەلایەکی دیکەشەوە پۆلیس هاوکاری دەکات و چەکی پێدەدات. ئەو کەسەی پێشتر پارەی جگەرەیەکی نەبووە، کاتێک پارەو چەک و پشتگیری پۆلیس دەبینێت، ئایا هیچ رادەوەستێت؟ راناوەستێت و کاتێک دەڵێن "ئەوە چەک و برۆ فلان کەس بکوژە" دەچێت و دەیکوژێت. لە ئەنجامدا رۆژانە چەندین مرۆڤی وڵاتپارێز بە دەستی ئەوانە دەکوژرێن. رووداوەکە بەمجۆرەیە و موسلمانێتیش بە تەواوەتی دەمامکێکە.

جاران لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژی هێرشیان دەکرد. کاریگەری سۆسیال-شۆڤینیزمیش ناوە بە ناوە بە توندوتیژی گەیشت. ئێمەش بە توندوتیژی وەڵاممان دانەوە. ئەوەش ڕێگای لەبەردەم گفتوگۆی مەزن کردەوە. هاوکات نەتەوەپەرەستی سەرەتایی کوردیش تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی لەگەڵمان هەبوو. ئەوەش ناوە بە ناوە بە توندوتیژی گەیشت. وەک لە نموونەی (KUK)دا ڕوویدا ئێمەش بە توندوتیژی وەڵاممان دانەوە. لە ڕاستیدا تێکۆشانمان لە بەرامبەر ئەو مەزهەب و تەریقەتە ساختانە ماوەیەکی درێژ بوو لە ئاستی ئایدیۆلۆژیەوە بەرێوە دەچوو. بەڵام ئێستاکە ئەوانە دەستیان بۆ چەک بردووە. وەک دیارە کە لە بەکارهێنانی چەک و درێژە پێدانی توندوتیژی بەردەوام دەبن. پێویستە چۆنێتی و بەرفراوانی کارەکە بە باشی ڕەچاو بکرێت. ئەو حزبولّاچێتیەی چەک بەکار دەهێنێت چییە؟ واتە حزبولّاچێتی چییە؟ کاتێک سەیری ئەو ڕاستیە دەکەین، حزبولّاچیەکان کە ئەو چەکە بەکار دەهێنن، واتە ئەو گەنجانەی لەو کارانەدا جێ دەگرن، تەنانەت واتای وشەی حزبولّاش نازانن، چونکە وشەیەکی عەرەبییە، ئەوانیش عەرەبی نازانن. ئەو شتەی لەو کاتەدا لای مەبەستە و گرێیان دەدات؛ چەک و بڕە پارەکەی وەری دەگرێ، ، ئەو پایەو هاوکاری و پاڵپشتیەیە کە بەدەستی دێنێ.

لەو چوارچێوەیەدا پێویستی بە ڕۆشنکردنەوەیەکی زۆر ریشەیی و بنەڕەتی هەیە. تەڵەزگە و گەمەیەکی مەزن لە ئارادایە. گەنجان و منداڵانێک لەناو ئەو تەڵەزگە و گەمەیەدا جێ دەگرن کە لە تەمەنی ٧ ساڵیەوە مێشکیان شۆراوەتەوە. لەسەرەوەی ئەوانەشدا کەسایەتیگەلێکی ئایینی جێ دەگرن کە لە ژێر فەرمانی دەزگای هەواڵگری تورک و سیستەمی شەڕي تایبەتدان. ئەویش کەسایەتی ئایینی وەک فەیلەسوف وان. ئایا ئەوانەی بە درێژایی مێژوو ڕێگایان نیشانی سوڵتانە عوسمانیەکان دەدا، کەسایەتییە ئایینیەکان نەبوون؟ ئێستاش کەسایەتی ئایینی هەن کە ڕێگا نیشانی هێرشەکانی کۆماری تورک دەدەن. بۆ نموونە، ئەو عەدنان خۆجا ساختەیە چۆن هێنرایە مەیدانەوە؟ بە تایبەتی منداڵانی دەوڵەمەندانیان سڕ کرد. سەرجەم ئەو شێخە نەقشبەندییانەی لەو ماوەی دواییدا لە کوردستان خراونەتە جوڵەوە بە شێوەیەکی سەرسورهێنەر پەروەردە کراون و بە گوێرەی خۆشیان زانا و تێگەیشتوون. هەموو شتێک دەزانن، بەڵام تا مەرگەوە گرێدراوی بەرژەوەندیەکانیانن. بەرژەوەندیەکانیشیان لە بنەڕەتدا لەلایەن دەوڵەتەوە دابین دەکرێت.

دەکرێ ئەوە بووترێت؛ لە ژێرەوە گەنجانی هەڵخەڵەتێندراو، لەسەرەوەش بەناو کەسایەتییە ئایینیەکان و سەرۆک تەریقەتەکان یەکیان گرتووە و تەڤگەرێکی هێرشی ئایدیۆلۆژییان بەرەو تەڤگەرێکی هێرشی چەکداری وەرچەرخاندووە. لەوانەیە هێزەکەیان سنووردار بێت و نەتوانن کاریگەریەکی زۆر دروست بکەن. بەڵام جارێکی تر پشتیوانی بناخەیەکی مێژوویی و کۆمەلایەتی بەمجۆرەیان لە پشتە، لەوەش گرنگتر پشتگیری کرداری بەرێوەبەری رەوشی نائاسایی و بەرێوەبەری شەڕی تایبەت لە ئارادایە. پێیان دەووترێت" بکوژە، من پاڵپشتیت لی دەکەم و دەتپارێزم". لەو سۆنگەوە؛ ئێستاکە ئەوانە لە شارەکانی سیلوان، باتمان و ئامەد شانبەشانی پۆلیسەکان دەگەڕێن و دەسوورێنەوە. روون و ئاشکرایە کە بەرێوەبەری شەڕی تایبەت ئەوان دەکرێ و گەرەنتیان پێ دەدات و دەووترێت" کاتێک دەستگیر کرای، حەشارت دەدەم". هەڵبەتە لە زەمینەیەکی بێ کاری هەرەس ئاسا، رێژەیەکی زۆری کەسانی هەڵخەلەتێندراو هەن کە بە پارە بکرِدرێن و کەسانێکیش هەن کە بە تایبەتی پێگەیەندراون. روورەشە نوێیەکان کە هەوڵی رێکخستنیان دەدرێت، واتە تەڤگەری نوێی فاشیست لەسەر ئەو بنەمایەیە. بەکارهێنانی ناوی حزبولا (پارتی خودا) تەنیا خۆ حەشاردانە لەژێر ئەو زاراوە بالا و وشانەی گەل حەزی لێدەکات و بۆی گرنگە. لە هەر سەردەمێکدا بەمجۆرە بووە. ئەو هێزانە باشترین ناو لەخۆیان دەکەن، تیۆری هەرە باش دادەرِێژن، بەلام کرداریان پێچەوانەی وتەکانیانە. هەمیشە لەژێر ناوی هەرە باش کاری پێچەوانە و خراب بەرِێوە چووە. ئەوەی ئەوانەش ئەنجامی دەدەن، هەڵخەلەتاندن و گومرا کردنە.

ئەو هێزانە هیچ پەیوەندیەکیان بە ئیسلامی راستەقینەوە نییە. حزبولا هیچ پەیوەندییەکی بە خوا و ئیسلامەوە نییە. ئەو وشانە لە زاری ئەوانەدا وەک قولابی ماسیگرتن، وەکو قولابێکی تەڵەزگە رۆڵ دەگێرێت. لەوانەیە بە ووتنی"پارتەکەی ئێمە پارتی خودایە، ئێمە بە ناوی خوداوە شەڕ دەکەین" هەندێک گەنجی پاک و سادە رازی بکەن و بەو وشانە هەڵیانخەڵەتێنن. دەکەونە دۆخێکەوە کە بلێن" ئەگەر بمرین دەچینە بەهەشت، بریندار بین دەبین بە کەمئەندام". هەروەها دەشلێن" ئەگەر هیچ شتێکیش روو نەدات، ژیانێکی خۆش چاوەڕوانمان دەکات". بەلام ئەوە هەڵخەلەتاندنێکی ئایدیۆلۆژییە. دۆخی گەلەکەی و مێژووەکەی خۆی چییە؟ زۆر جار پرسیاری لەو جۆرەمان دووبارە کردەوە، بەراستیش ئەمەنە چیان دەوێت. بەلام هیچ هەواڵێک لەوانەوە نییە. هەندێکیشیان لەوە ئاگادارن کە شتێکی

باش نییە و زۆر خەمبار دەبن. بەڵام ئەوانەی جینایەت و تاوانیان ئەنجام داوە، بەرژەوەندییان لای دەوڵەت هەیە. بەرژەوەندیەکانیان خودا و ئیمانەکەیانە.

بەمجۆرە دەکرێ بووترێت: ناوەند و دەورەبەرە خائینەکانی بە ناوی چەپڕەویێتیشەوە لە کوردستان جوڵە دەکەن ، هەروەها سەرجەم چین و کەسایەتییە خائینەکانی سەدەی دوایی و ئەو دابونەریتە خیانەتکاریەی بە گوێرەی ئەو شکڵیان گرتووە، وەک خیانەتکارترین و فاشیستانەترین بناخەی نەتەوەپەرستی باڵا دەست رێکخراون. لە کاتێکدا نەتەوەپەرستی دەسەڵات لە بەرەکانی شەڕ بە سوپاکەیەوە سەرقاڵی جەنگ بوو، یەکینەکانی شەڕی تایبەت و جاش و جەردەوانانی گوندیش وەک پارچەیەکی ئەمە پێشخرا و پەرەی پێدرا. هەروەها پارتە سیاسیەکانی سیستەمیش هەن؛ DYP (پارتی رێگای راست), SHP (پارتی گەلی سۆسیالیست) بە یەکگرتنیان لەگەڵ ژمارەیەکی دیکەی پارتەکانی سیستەم بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکرێگیراوی و نۆکەرێتی رژێم دەکەن. هاوکات خائینانی خۆجێییش لەناو ریزەکانی سوپای کۆماری تورک لە دژی گەلەکەی خۆیان شەڕ دەکەن. جاش و جەردەوانەکانیش هەن. یەکینە فاشیستەکان بە ئاشکرایی بوونیان هەیە. تیمە تایبەتەکان خودی یەکینە فاشیستەکانن.

یەکینەکانی سوپای تایبەت هەیە کە لە "کۆماندۆ" کان پێکهاتووە. لە کاتێکدا سەرجەم ئەوانە لە بەرەیەکی کراوەدا شەڕ دەکەن، هاوکات لەخۆیان دەپرسن: "ئایا وەک پاشماوەیەکی دوایی ناتوانین ئیسلامیەت بەکار بهێنین، ئایا ناتوانین هەستە ئایینیەکانی گەلی کورد بقۆزینەوە و بەکاری بهێنین، وەک چۆن لە مێژوودا روویداوە ئایا لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا بەو رێبازە ئەنجام وەرناگرین؟" بەڵێ پرسیاری لەو جۆرە پێشدەخەن و لە بارەیانەوە قاڵدەبنەوە. ئەو وەڵامەی دراوەتەوە ئەم پرسیارانە ئەم هێرشانەی حزبوڵایە، لە رێگایەوە دەخوازن وڵاتپارێزان بکوژن و گەل بەرەو پەشێوی و سەرگەردانی ئاراستە بکەن. ئایا حزبوڵای دەستی پۆلیس شەڕێکی دەسەڵات بەرێوە دەبات؟ نەخێر، بەڵکو ئامرازێکی سادەو بێ نرخی شەڕی دەستی دەسەڵاتە. ئامرازێکی شەڕی دژە-شۆڕشگێرییە. لێیان دەپرسین؛ ئایا لە ژێر چاودێری پۆلیس بەهەشت ئاوا دەکەن؟ ئایا "پارتی خودا" لەژێر سایەی پۆلیسەوە، بە تایبەتیش پۆلیسی کەمالیست؛ لە ژێر چاودێری، پاراستن و بە هاوکاری پۆلیس و تیمی تایبەت بە ئامانجەکانی دەگات،

دەچێتە بەهەشت یاخود ئەو دونیایە دەكاتە بەهەشت؟ پۆلیس لەژێر خزمەتی كام ڕژێمدایە؟ روون و ئاشكرایە كە لە خزمەتی "زایۆنیزم"دایە. ئەوانە زۆربەیان خۆیان وەک دژە- زایۆنیست پیشان دەدەن، بەڵام ڕژێمی ئێستا لە ئیسلامیزم زیاتر نوێنەرایەتی زایۆنیزم دەكات.

هەرزۆكی سەرۆک كۆماری ئیسرائیل ئەمەی ووت:" ئێوە هەر چی لەبەرامبەر بە كورد بیكەن، ئێمە پەسەندی دەكەین، ئێمەش ئەوەی لەبەرامبەر بە عەرەبەكان و فەلەستین دەیكەین، ئێوە پەسەندی بكەن". ئایا هەرزۆگ مۆڵەتی هێرشێكی بەمجۆرەی لەبەرامبەر بە كورد داوە؟ ئایا ئەو هێرشە بە فەرمانی هەرزۆگەوە، توركێتی بەرێوەی نابات و جێبەجێی ناكات؟ یاخود ئایا ئێوە ئامرازێكی هێرشكردن نین بە دەستی پۆلیس و توركایەتیەوە؟ لەو واتەیەدا ئێوە نۆكەری ئیمپریالیزم نین؟ روون و ئاشكرایە كە حزبولاگەراییش بە لانیكەم هێندەی فاشیزم و كەمالیزمی تورک نۆكەری زایۆنیزمە.

ئایا ئاگادارن كە پۆلیسی تورک كەمالیستی تەواو عەیارن؟ ئایا لەو كردەوانە ئاگادار نین كە تیمە تایبەتەكان و شەڕی تایبەت بە ناوی كەمالیزم ئەنجامیانداوە؟ وێڕای ئەو كارو كردەوانەشیان ئەی ئێوەش هاوڕێ و دەست لەناو دەستی ئەوان نین؟ گوایە دەڵێن ئێمەش لە دژی كەمالیزم و ئایدیۆلۆژیای فەرمین، بەڵام شەڕكردن لەژێر چاودێری و پاراستنی ئەوان واتای نۆكەرایەتیكردن بۆ ئەوان نییە؟ ئایا تا ئێستا خوێنتان لە لووتی تاكە كەمالیستێک هێناوە؟ ئایا تا ئێستا خوێنتان لە لووتی هیچ تاكێكی زایۆنیست هێناوە؟ كەواتە ئەگەر زایۆنیزم ڕژێم و كەمالیزمی تورک بەخێو و مەزن دەكات، ئەوا ئەوەی ئێوەش بەخێو دەكات و مەزنی دەكات زایۆنیزمە. لەو سۆنگەوە؛ بە شێوەیەكی ناراستەوخۆ ئێوە دەبنە نۆكەری زایۆنیزم.

شتێک نییە كە لەگەڵ كەسە پاک و سادەكانی ناو حزبولا دانوستاندنمان نەبێت، بەڵام بە راستیش ناچارین ئەوەیان پێ رابگەیەنین كە بە دەستی سێیەمەوە حزبولا ئامرازێكی دەستی زایۆنیزمە. ئەوانە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندییان بە دژە- زایۆنیزم، دژە- كەمالیزم و دژە- ئیمپریالیزمەوە نییە. تەڤگەری هەرە مەزنی دژە- ئیمپریالیزم و دژە- زایۆنیزم تەڤگەرێكە كە PKK ئاراستەی كردووە. ئەوەش زۆر روون و ئاشكرایە. ڕۆژانە شەڕ دەكەین و لەو پێناوەدا بە دەیان لە شەڕڤانانمان بە قارەمانی شەهید دەبن. لەو واتایەدا ئەوەی پارێزگاری لە ئیسلامیەتیش دەكات PKK یە، ئەوەی لەبەرامبەر دوژمنانی گەلانی موسڵمان

پارێزگاری لە ئیسلامیەت دەكاتPKK یە. دوژمنانی گەلە موسلمانەكان ئەمڕۆ زۆر ئاشكرا و دیارن. ئەوانەش ئیمپریالیزم و نۆكەرەكانی، واتە كەمالیست و زایۆنیستەكانن. لەبەرامبەر ئەوانەشدا ئەوەی هەر ڕۆژ شەڕێكی سەخت و دژوار بەڕێوە دەبات PKK یە. ئایا سەرگەورەكانی حزبولا هیچ كاتێك شەڕێكی لەو ئاستە و لەمجۆرەیان پێشخستووە؟ با بڵێن ئێمە دێین و شەڕ دەكەین، ئێمەش چەكەكانی خۆمانیان پێ دەین. بانگەوازیمان لێیان كرد و پێمان ڕاگەیاندن كە بێن و بە یەكەوە لە دژی كەمالیزم، ئیمپریالیزم و زایۆنیزم شەڕ بكەین. چەك و پارەیان نەبێت، ئێمە پێیان دەدەین. ئەگەر ئامادە بن بەشێكی چیاكانیان رادەست دەكەین.

لە جیاتی ئەوەی هێرش بكەنە سەر وڵاتپارێزان و بیانكوژن، با هێرش بكەنە سەرهێزە فاشیستەكان یاخود زایۆنیست و ئیمپریالیستەكان كە گوایە زۆر جار رەخنەیان لێ دەگرن. مادام دەڵێن دژی ئیمپریالیزمین، با هێرش بكەنە سەر ئەوان. سەبارەت بە سەرجەم پرسیار و بانگەوازیەكانمان لەم بوارەدا، هیچ وەڵامێكیان نەبوو و تەنانەت نووقەشیان لێوە نەهات. دەڵێن" PKK كافری هەرە مەزنە، تاكە مەترسی PKK یە". ئەمە چ پەیوەندییەكی بە دژە ئیمپریالیستیەوە هەیە؟ لە كاتێكدا راستیەكان تا ئەو رادەیە روون و ئاشكرایە، دەكرێت نكوڵییان لێ بكرێت؟

لە راستیدا پێویست ناكات ئەو راستیانە هێندە باس بكەین و دووبارەی بكەینەوە. تا رادەیەك هەوڵماندا دۆخی ئەو مندالانە یاخود ئاراستەكارانی ئەو كارە بخەینەڕوو. لەبەر ئەوەی هەوڵیانداوە سەر لە گەل بشێوێنن، بە ئامانجی رۆشنكردنەوەی گەل، هەروەها بەو ئامانجەی هەڵسەنگاندنێكی راست و دروستی ئەو پێكهاتە ڕووڕەش و ساختەیە بكەین كە لەلایەن نەتەوەپەرستی توركەوە دروست كراوە و زۆر مەترسیدار و تاریكە، سەرجەم ئەمانەمان خستەڕوو و شیكردنەوەمان بۆ كرد. بەبێ هیچ گومانێك ئەو هێرشە نوێیە، ئەو هێزە تاریكە و بزاوتە ڕووڕەشەكەیان بە خێرایی تەشهیر و گۆشەگیر دەبێت. هەر لە ئێستاوە، بە تایبەتیش لەو هەرێم و دەڤەرانەی كە زۆریان بڕوا و متمانە پێ بوو، دووچاری گۆشەگیریەكی مسۆگەر هاتوون. ئیدی گەل گەیشتوتە ئاستێك كە خۆی سزایان بدات. دڵنیام كە دوای هەوڵ و كۆششێكی بەرچاو، بە تایبەتیش دوای پێشخستنی زیاتری تێكۆشانی گەل، ئیدی بە رەوشێك دەگەن كە كون و كەلەبەرێك نەمێنێت بتوانن خۆیانی تێدا حەشار بدەن. خۆی لە خۆیدا هەر لە ئێستاوە سەرجەمیان لە

دۆخێکی راکردنـدان و هـەڵـدێن. لـەمیانی گـۆڕینی جلـو بـەرگ و رەنگـەکانیان هەوڵدەدەن خۆیـان حەشـار بدەن. لەوانـەیە لـە داهـاتوودا ئـەو هەلەشـیان دەست نەکەوێت.

ئێستا رووی قسەم لەو کەسانەیە کە راستگۆن؛ دادپەروەری ئەو ئیسلامیەت و شۆڕشـە چییـە کـە ئێـوە باسـی لێـوە دەکـەن؟ پێویسـتە بـە باشـی فێـری بـبن! هەروەها پێویستە بزانن شۆڕشی ئێران و رەوشە ئیمانداریەکەی چییە، پێویستە بە باشی فێری ئەوانە ببن! ئەمە بە قسە نابێت، بە چالاکی دەبێت. بەڵێ بـە قسـە بـاس لەوانە دەکەن، بەڵام چەک لە پۆلیس و پارەش لـە بـرا گـەورەکانتان وەردەگرن و گوایە لە دژی کافران تێکۆشان دەکەن! بەو شێوەیە ناتوانن خۆتان هـەڵخـەڵـەتێنن! ئـەوە هەوڵدان و دۆخێکی زۆر مەترسـیدارە. بـاش بیـر بکەنـەوە، هـیچ ئـامرازێکی بەرگریتان لە دەستدا نییە. هیچ بڕو بیانوویەکتان نییـە و تەنانـەت بـە دوو وشـەش ناتوانن خۆتان بپارێزن. ئەگـەر بـەمجۆرە بـەردەوام بـن، ئـەوا لـە سـیفەتی نـەفرەت لێکراوترین گروپی مێژوو رزگارتـان نابێت. پێویسـتە دەسـتبەجێ داوای لێبـوردن بکەن، بە تایبەتیش ئەوانەی زۆر لە بەرژەوەندیپەرسـتیەوە نـەگلاون، پێویسـتە بـە خێرایی بە رەفتار و هەڵوێستەکانی خۆیاندا بچنەوە و داوای لێبوردن بکەن.

بە تایبەتی بانگەوازی لەو لایەنانە دەکەیـن کـە دەیانـەوێت ئێـران بـەکار بهێنن. ئێـران هێشـتا هەنـدێک تایبەتمەنـدی دژە- ئیمپریالیسـتی و دژە- زایـۆنیزمی هـەیـە. هاوکات بە ئێرانیش دەڵێین؛ ئەگەر لەسەر ئەو بنەمایە ناتانەوێت پێچەوانەی خۆتان بکەونەوە، ئەگەر نیازێکتان هەبێت هێرشمان بکەنـە سـەر، بـە خێرایـی کۆتـایی بـەو دۆخـە بێنن! پێویسـتە ئاگادار بـن و جارێکی دیکـە نەکەونـە ئـەو رەوشـەوە، بۆیـە هۆشیار بن. بە راستیش ئەگەر دەخوازن لە دژی ئیمپریالیزم، زایۆنیزم و کەمالیزم تێکۆشان بکەن، جێگای خۆتان لە ژێر ئەو ئاڵا شەکاوەکەی PKK دا بگرن، جێگای خۆتان لەناو ریزەکانی رزگاریدا بگـرن. تـەنیا لـەو رێگایـەوە دەتـوانن راسـتگۆیی و هـەڵوێسـتی بـە پرەنسـیپانەی خۆتـان بسـەلمێنن. هاوکـات رێـژەیـەکی زۆر گـەنجی هەڵخەڵەتێنراو هەیە. ئاگادارین کە بە رێگا و رێبازی زۆر جیاواز هـەڵخەڵـەتێنراون. با ئەوانەش چاوەکانیان بکەنەوە، با ببینن کە براکانی خۆیان و مرۆڤـی هـەرە هێژا دەکوژن، با بە خێرایی واز بهێنن و دەستیان لێ بکێشنەوە. پێویسـتە بـزانن رێگـای لێبوردن تەنیا بە یەکگرتنیان لەگـەڵ تـەڤگـەری شۆڕشـگێڕیدا دەربـاز دەبێت، دەبێ داوای لیبوردن لەو تەڤگەرە بکەن و هەڵوێستێکی بەمجۆرە پیشان بدەن.

پێویستە لەسەر ئەو بنەمایە لەهەر لایەنێکەوە راستیەکان روون بکەینەوە و گەلەکەمان ڕۆشن بکەینەوە. تاکە هەڵوێستی راست بۆ گەلەکەمان؛ سەرەتا بە شێوەیەکی راست ئەو مەترسییە شی بکاتەوە، دواتر تەشهیر و گۆشەگیری بکات، کاتێک بە چەکیش هێرشیان بکرێتە سەر بە دژواری وەڵامیان بدەنەوە و تەختیان بکەن. داوا لەگەلەکەمان دەکەین تا دوایی پابەندی ئەو هەڵوێستە بمێننەوە و بەمجۆرە بەرەو پێشەوە بڕۆن. هەروەها لەبەر ئەوەی بە شێوەیەکی زۆر چەپەڵ و فێڵبازانە مرۆڤەکانمان دەکوژن؛ چۆن دانە بە دانە و دوو بە دووی مرۆڤەکانمان لە پشتەوە گوللەباران دەکەن؛ پارتیشمان تیمی نیشانبڕی تایبەت لە بەرامبەریان ئاوا دەکات، لە شوێنی گونجاو، سەرکردەکانیان و بکوژانی ولاتپارێزەکانمان بە سزای پێویست دەگەیەنن. لەو چوارچێوەیەدا پێویستی بە تەڤگەرێکی توندوتیژی زۆر بە سیستەم و رێکخراو هەیە.

لەو مژارەدا تاکە رێگای راست لە پێشماندایە: پیشاندانی هەڵوێستێکی راست لەبەرامبەر بەو ئەرکانەی بە ناتەواوی ماونەتەوە؛ لێکۆلینەوە و توێژینەوە ئەنجام بدەین، زانیاری کۆ بکەینەوە، چاودێرییان بکەین بە شێوەی پێویست و لە شوێنی خۆی سزای شایستە بدرێن. نەماندەویست زۆر خۆمان بەوانەوە سەرقاڵ بکەین. بە تایبەتی دوای ئەوەی حکومەت هەموو دەرگاکانی بۆ ئاوالّا کردن تا پەلامارمان بدەن، بەمجۆرەش بە دەیان بوویەری بکوژی نادیار روویدا، دۆخێکی وەهای دروست کرد کە ناکرێت ئەو مەترسییە پشتگوێ بکەین؛ بۆیە هەڵوێستێکی راست وەکو مەرجێک فەرز دەکات.

وەک ئەنجام؛ ئەمەیە مانای ئەو تاخمەی لە ژێر ناوی"ئیسلامگەرا-حزبولّاگەراکان" بەسەر شۆڕشی شکۆداری رزگاری نەتەوەیی تەڤگەرەکەمان دەسەپێنرێت. PKK لە هەر کاتێکی خۆی زیاتر لە هەر تەریقەت و مەزهەبێک زۆرتر بە نەریتەکانی مێژووییەکانی گەلانی رۆژهەلاتی ناوین، بە جەوهەری شۆڕشگێری و لایەنەکانی یەکسانی و دادپەروەری ئیسلام گرێدراوە. لە ئاستی رێبەرایەتیدا تەڤگەرێکی هەرە بە بڕیارە کە لەبەرامبەر ئیمپریالیزم، زایۆنیزم و کەمالیزم (ئیسلام) دەپارێزێت. هەر چەندە دەستەواژەکانی ئیسلام بەکار ناهێنێت، بەلّام تەڤگەرێکە کە خاوەنی گەوهەرێکەی بەمشێوەیە. خاوەنی خۆشبینیەکی قووڵی ئایینی یە. هەڵوێستێکی دیموکراتیانەی بەرامبەر ئایینە جیاوازەکان هەیە، هەروەها نرخ و بەهایەکی زۆر بە بەها مێژووییەکانی لایەنی باشەی ئەو

مەزهەبانە دەدات کە بە تایبەتی خزمەتی پێشکەوتنی میللی و کۆمەڵایەتی دەکەن. ئەو هەڵوێستەی تەنیا سەبارەت بە ئیسلام پەیڕەو ناکرێت، بەڵکو لە چوارچێوەی مەزهەبە جۆراوجۆرەکان، ئایینە جیاوازەکانی دیکە و کەمایەتیەکانیش بەو شێوەیە. لەو واتەیەدا تەڤگەری هەرە دیموکراتی و خۆشبینە.

ئەوەی لە مێژووی گەلانی رۆژهەڵاتی ناویندا گرنگە: لەجیاتی ئەوەی لە ژێر دەمامکی راستینەی کۆمەڵایەتی و میللییەوە گەلان لەبەرامبەر یەکتر بەکار بهێنرێن، بە پێچەوانەوە، لەبەرچاو گرتنی یەکسانی نێوان گەلان گرنگیەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت کە لە چەمکی برایەتی ئایینەکانی ئیسلامیەت و مەسیحیەتیشدا بە شێوەی ئەنتەرناسیۆنالیزم زۆر بە کاریگەرە. ئەگەر ئەو مژارە لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا بە باشی هەڵسەنگێندرێت، بێ ئەوەی بەرەو فاشیزم و شۆڤینیزم بخزێت، دەکرێت خزمەتی هاوکاری نێوان گەلان بکات. ئێمە بایەخێکی زۆر بەو بابەتەش دەدەین. واتە لە کاتێکدا ئەوان ئایین بۆ شۆڤینیزم و نەتەوەپەرستی بەکاردەهێنن، ئێمە بە پێچەوانەوە، ئەمە بۆ یەکسانی و برایەتی بەکاردەهێنین. بە گوێرەی ئەوەی ئەمە واتای راستەقینەی ئایینە، کەواتە لەهەموویان زیاتر ئێمە وەڵامی هەرە راست سەبارەت بە نەریتی میللی مێژووی گەلان پێشکەش دەکەین.

لە کاتێکدا راستیەکان بەمجۆرەن و لەو پێناوەشدا گەلەکەمان بە ڕێبەرایەتی پارتەکەمان تێکۆشانی راستەقینە ئەنجام دەدات، پێشخستنی هەڵسەنگاندنی جیاواز، تەنیا خزمەتی داگیرکەری هاری تورک دەکات کە لەبەرامبەریدا شەڕ دەکەین، خزمەت بە شێوە کەمالیستیەکەی و ئەو زایۆنیزم و ئیمریالیزمە دەکات کە خۆی پێ سپاردووە. پێویستە بەشێوەیەکی راست PKK یان بۆ پێناسە بکەین: چونکە ئەگەر PKK بۆ خۆیان وەکو کۆسپ و تەگەرەیەک دەبینن و هێرش دەکەن، بەو واتایەیە کە دەکەونە ریزی هەمان ئەو دوژمنانەی کە زۆر جار وەک دوژمنی خۆیان باسی لێ دەکەن. لەو بارەیەوە پێویستە بە خێرایی ئاڵۆزی نەمێنێ و ریزەکانیان زەلال بکرێت.

لە کاتێکدا ئێمە هەم بە چالاکیەکانمان و هەم بە هەڵوێستی سیاسیمان بەو رادەیە بە شەفافی بەرپرسیارێتی سەرشانمان دەخەینەڕوو، بە هەمان شێوە ئەو کەسانەی کە خەڵەتێنراون یاخود خزێنراونەتە ناو سەرلێشێواویەوە و سەر بە ناوەندو دەوروبەرێکی نوێ و جۆراوجۆرن، پێویستە نەک تەنیا بە قسە، بەڵکو پێویستە بە شێوەیەکی راست بە چالاکیەکانیان (کردار) ریزەکانیان ئاشکرا بکەن، ئەگەر بڕوایان بە ئیسلام هەیە دەخوازین بە شێوەیەکی دڵسۆزانە گرێدراوی

گەوهەرە یەکسانیخواز و ئازادیخوازەکەی ببن و ئەمەش بسەلمێنن. هەم بە قسە و هەم بە چالاکی بە شێوەیەکی واقیعی و بەرجەستە ئەوەمان نیشانی هەموو جیهان داوە و سەلماندومانە. ئێستاکە نۆرەی ئەوانەیە. دەمانەوێت ئەوەش بخەینەڕوو: ئەگەر ئەم هەنگاوە نەنێن و لەبەرامبەرماندا شەڕ بکەن، ئەو کاتە ئێمەش تا دوایی دەیانخەینە ژێر گوشارەوە و زۆر بێ بەزەییانە سەرکوتیان دەکەین.

بەخۆ باوەڕین و تا دوا رادە ئامادەین وەک چۆن وەڵامی هەر جۆرە هێرشێکی فاشیزمی ١٢ ی ئەیلول و داگیرکاری تورک و تەواوی مێژووی شۆڤینیمان داوەتەوە، وەڵامێکی پڕ بە پێستی ئەو شێوە هێرشەش دەدەینەوە. لەوانەیە بەو ئامرازە (حزبولڵا = حزبول کۆنترا) ریژەیەکی زۆر لە وڵاتپاریزان بکوژرێن. بەڵام تووڕەیی مەزنی گەلەکەمان کە رووی لە زیادبوون کردووە، هەر لە ئێستاوە ئەو چەکەی پووچەڵ و پێچەوانە کردۆتەوە. بەکارهێنانی چەکی ئایین، باجەکەی بۆ داگیرکەران زۆر قورس دەبێت و بەجۆرێک بە سەریاندا دەشکێتەوە کە لە هیچ سەردەمێکدا دووچاری نەهاتوون. ئەو شتەی گەلەکەمان لە مێژووی خۆیدا نەیتوانیوە ئەنجامی بدات، واتە بۆ یەکەم جار دەرفەتی وەڵامدانەوەی ئەو ساختەکاریانەی بەدەست هێناوە کە بە ناوی ئایینەوە دەکرێت، ئێستا بە تووڕەییەوە ڕادەپەڕێت و گرێدراوی روونکردنەوە راست و ماقولەکانی پارتی دەمێنێتەوە. بە تووڕەییەکی زۆرەوە بەسەریدا دەچێت و ئەوەی لە مێژووی خۆیدا نەیتوانیوە ئەنجامی بدات، ئێستا جێبەجێی دەکات. ئەمەش لە هەمانکاتدا سەبارەت بە لێپرسینەوە وحیساب خواستنی مێژوویی بۆ گەلەکەمان دەبێتە دواترین و سەرکەوتووترین هەنگاو. با لە هەر کاتێک زیاتر ئەم گرۆپە تاریک، هۆڤ و فاشیستانە بە باشی بیان ناسین، تەشهیر و گۆشەگیریان بکەین کە بەسەر راستینەی نەتەوەیی، کۆمەڵایەتی و مێژوومان‌دا سەپێنراوە، با بە تەواوی هێزمانەوە هێرشیان بکەینە سەرو سەرکوتیان بکەین!.

بە کورتی دەتوانین هەڵسەنگاندنێکی بەمجۆرە ئەنجام بدەین. بەو شکڵە لەمیانی رێنومایییەکی نوێوە دەرفەتی هەڵوێستێکی راستتر دێتە ئاراوە. پێویستە هەندێک لەو نیاز پاکانە خۆیان سەرەراست بکەن و ئێمەش تێکۆشانێکی بە بڕیاردارتر لە دژی کۆنترا و بکوژەکان پێش دەخەین و بەرێوە دەبەین.

سکرتێری گشتی PKK

نۆی ئابی ١٩٩٢

گەلێک کە لەژێر دژوارترین هەلومەرجدا رووبەڕووی ئابلۆقەی سەرجەم سەرمایەدارە جیهانگیرییە زۆردارەکان بۆتەوە، لەژێر هێرشی پێشکەوتووترین تەکنۆلۆژیاکانی شەڕدایە، هەر شتێکی تالان دەکرێت؛ بەڵێ شەڕڤانانی گەلی کورد کە دووچاری ستەم و چەوسانەوەی ئیسلامی ساختە هاتووە، جەنگاوەرانی ئەو کۆمەڵگایە تەنیا و تەنیا دەشێ قارەمانێتیەکی هاوشێوەی حەزرەتی عەلی شایستەیان بێت. هیچ گومانێکم لەو راستییە نییە کە نوێنەرایەتی دادپەروەرانەترین، ئازادیخواز و دیموکراسیخوازانەترین نەریتی ئایینی ئیسلام دەکەین. بێگومان بە ئەندازەی شایستەبوونی پێشەنگایەتی هاوبەشیکردنی رۆژانەیی ئەو راستینەیە لەگەڵ تەواوی گەلە مەزلوم و ستەملێکراوەکانی جیهان، سەبارەت بە نوژەنبوونەوەش کە ئەمڕۆ و داهاتوو کردوویانە بە پێویستیەک بە بانگەشەترین بزووتنەوەین.